




# خۆری ئیسلام

ارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە ، وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات

ساڵی چوارەم ژمارە/ ١٤ ڕەمەزان ١٤٢٢ هـ سەرماوەزی ٢٧٠١کوردی کانونی یەکەم ٢٠٠١ز






## ڕەمەزان مانگی «ڕەحمەت و بەرەکەت»
## لە موسڵمانانی کوردستان پیرۆز بێت





بسم الله الرحمن الرحيم

شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ

صدق الله العظيم

**لای هەموو لایەك شاراوە نییە، كەبۆنە ئاینییەكان لای هەموو موسڵمانانی جیهان هەردەم جێگای تایبەتی خۆی هەیە، هەموو كاتێك بە شكۆدارییەوە پێشوازی لێ دەكرێت.**

**گەلی كوردیش لە كوردستانی خۆشەویستدا تەنانەت لەهەلومەرجە دژوارەكانیشدا بەدڵێكی پڕ لەیەقین و ئیمانێكی پتەو. سەر رۆژەوە كە خواوەندی پەروەردگار هیدایەتی داوەو ئایینی پیرۆزی ئیسلامی پێ رەوابینیووە، بەتین و گوڕێكی تەواوەوە پێشوازی لەو بۆنە پیرۆزانەدا كردووە و، ئەركی عیبادەتی جێبەجێ كردووە بەوشێوەیە كە لەشەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا هاتووە، یەكێك لەو بۆنە گران بەهاو بەقەدرانەش هاتنی مانگی رەمەزانە، كە لەو مانگەدا فەریزەتی رۆژوو گرتن جێبەجێ دەكرێت و عیبادەت و تاعەتی تێدا دەكرێت و خێرو خێراتی تێدا ئەنجام دەدرێت.**

**دەبێ ئەوەش فەرامۆش نەكەین، كە زانستەكان و توێژینەوەی ورد ئەوەی سەلماندووە كە خوداوەندای پەروەردگار هەر ئەركێكی ( تعبدي) بۆ ئادەمیزاد دانابێت بۆی دیار كردبێت بێ حیكمەت نەبووە و، هەردەم جێبەجێ كردنی هەر ئەركێكی (تعبدي) لەگەڵ ئەوەشدا كە (تأكيد)ی بەندایەتی بۆ خالقی ئەم كەونەی تێدایە، لەلایەكی تریشەوە سوودێكی بەدەنی و نەفسی هەیە بۆ ئادەمیزاد، ئەوەش نیشانەی رەحم و شەفەقەتێكی بێ سنووری خالقی ئەم كەونەیە لەگەڵ عەبدی خۆیدا.**

**فەرزی رۆژووگرتنیش یەكێكە لەو ئەركانە، كە وەكو پێشتر ئاماژەمان پێ كرد سوودێكی بەدەنی و نەفسیو كۆمەڵایەتی هەیە بۆ ئادەمیزاد، هەرچەندە ئەو سوودانە لە ژماردن نایەن، بەڵام جێگای خۆیەتی گەر ئاماژە بە هەندێكیان بدەین:**

**یەكەم: هەموو مرۆڤێك ساڵ (١٢) مانگ خواردن و خواردنەوە دەخواتەوە لەبەر پێویستی بەدەنی بۆ بەردەوام بوونی ژیانی ئەوەندەی تەمەنی هەبێت ئەم خواردن و خواردنەوەیەش بە مەجموعەیەك لە عەمەلیاتی فسلەجی و دینامیكیدا تێ دەپەڕێت تا ئەو خواردنە سوود بەخش بێت و وزە دابین بكات. لەبەر ئەوە رۆژووی مانگی رەمەزان وچاندان و فورسەتێكە بۆ هەموو دەستگا جۆراوجۆرەكانی لەشی ئینسان كەپشووییەك بدات بە سیستەمێكی تایبەت بۆ ماوەیەكی دیاركراو، ئەوەش لە رۆژووگرتندا خۆی دەنوێنێ.**

**دووەم: رۆژووگرتن هەموو مرۆڤێك رادەهێنێ لەسەر سەبرو تەحەمول و شوێننەكەوتنی داواكارییەكانی نەفس و زاڵبوون بەسەر ئەو داواكاریانەدا ئەوەش یەكێكە لە سیفاتی مرۆڤی موسڵمان.**

**سێیەم: لەمانگی رەمەزانی پیرۆزدا لەكاتی بەرۆژووبوون هەموو مرۆڤێك بیر لەوە دەكاتەوە كە خەڵكانێك هەن بەدرێژایی ساڵەهای ساڵ ئازاری برسیەتی دەچێژن، نەك مانگێك ئەوەش وا لە مرۆڤ دەكات كە بیر لە فەقیرو هەژاران بكاتەوە وەكو كێشەییەكی كۆمەڵایەتیو بەوە زیاتر پەیوەندی لەناو كۆمەڵ بەهێزتر دەبێت و هەتا رادەیەك جۆرە یەكسانییەك دروست دەبێت.**

**چوارەم: لەهەموو عیبادەتەكاندا بەتایبەتی لەمانگی رەمەزانی پیرۆزدا مرۆڤ زیاتر بیرلەوە دەكاتەوە كە هەموو كەسێك عەبدێكی بێ دەسەڵاتە هەر چەشنێك بێ پلەوپایەی لەدونیادا و، ئەو هیچ سەنگێكی نییە بەرامبەر ئیرادەی (رب العالمين) و مان و نەمانی بەستراوە بە ئیرادەی ئەو خالقەوە. رۆژی خۆی هەر كەسێك بەگوێرەی كرداری خۆی لەدونیادا، مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت بەبێ ئیمتیازدان بەهیچ مرۆڤێك، هەروەكو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ*إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ سورة الشعراء-٨٨-٨٩﴾ بۆیە لەو مانگە پیرۆزەدا كەخودا دەرگای رەحمەتی خۆی كردۆتەوە، ئەو بەندەیە زیاتر لە خالقی دەپاڕێتەوە و، دوعاكانیش گیرۆدە دەبێت.**

**پێنجەم: پیرۆزی مانگی رەمەزان لەوەشداییە، كە خواوەندی پەروەردگار پەیام و موعجیزەی خۆی بۆ پێغەمبەری مەزن ناردوە كە بۆ، رۆشنكردنەوەی رێگای تاریكستانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی.**

**لە كۆتاییدا لەخوا دەپاڕێینەوە. تاعەتی مانگی رەمەزانمان لێ قبول بفەرموێت خۆشیو برایەتیو ئاشتی لە وڵاتماندا زیاترو زیاتر بچەسپێت. پەناو پشتیوانی هەموو لایەكمان بێت.**

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير المرسلين محمد (ص) وعلى اله واصحابه الى يوم الدين.**




# خۆری ئیسلام
# 14

گۆڤـــاریکی رۆشـــنبیری زانســـتی ئیســـلامی وەرزییـــه وەزارەتـــی ئـــەوقاف و کاروبـــاری ئیســـلامی دەری دەکات

**ساڵی چوارەم**

**رەمەزان ١٤٢٢ کۆچی سەرماوەزی ٢٧٠١ ی کوردی**

**کانونی یەکەمی ٢٠٠١ی زایینی**

خاوەنی ئیمتیاز

**عەدنان نەقشبەندی**

سەرنووسەر

**خورشید شیرە**

جێگری سەرنووسەر

**سەلام کەریم سیدان**

بەڕێوەبەری نووسین

**مەلا عبداللطیف بامۆکی**

بەڕێوەبەری کارگێڕی

**قاسم رەسول بەرزنجی**

سکرتێری نووسین

**مەریوان مەحمود کاکە شێخ**



ناونیشان

هـــەولێر دیوانـــی وەزارەتـــی ئـــەوقاف و کاروبـــاری ئیسلامی

بەرێوەبەرایەتی راگەیاندن

☎ ٢٢٣٠٩٤٤

٢٢٢٢٦٩٣



پیت چنین: کۆمپیوتەری وەزارەت نەخشەسازی : کۆمپیوتەری دەریا فەرزی بەرگ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

# ناوەرۆك








﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَالَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً (٢٧) يَاوَيْلَتِي لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنًا خَلِيلاً (٢٨) لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنْ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلإِنسَانِ خَذُولاً (٢٩) ﴾

(صدق الله العظيم)

سورة الفرقان

لەو رۆژەی کە ناحەقکار پەشیمان دەبێتەوەو ئاخ هەڵدەکێشێ بۆ ئەو ماوەیەی ژیانی کە لەخوا پەرستن دووربووەو بەدەستی خۆی دادەنووسێو دەڵێ: خۆزیا لەگەڵ ڕێگای پێغەمبەر(د.خ) بڕۆشتمایە کە ڕێگای ڕاستی بوو لەهیلاکی ڕزگاری دەکردم، خۆزیا (فلان) کەسم بەهاوەڵ و ڕێنیشاندەری خۆم هەڵنەبژاردبایە کە ڕێگای لێ ون کردم و لەو ڕێگا ڕووناك و ئیمانداریەی کە پێشتر گرتبوومە بەر لایدام، شەیتانی بەدفەریش لەدوای ئەوەی کە هەر موسڵمانێك هەڵئەخەلەتێنیو بەرەڵای دەکات و پشت گوێی دەخات.




**عَنْ أَبي هُرَيرَة رَضيَ اللّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ :**
**(( اُنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أسفل مِنْكُمْ، وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ،**
**فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاتَزْدَرُوا نِعْمَةَ آللّه عَلَيْكُمْ )). مُتَّفَقٌ عَلَيْه**

سبل السلام/ ج٤/ ص٢٣٢

**لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە خۆشەویست( د.خ ) دەفەرموێ:**
**( تەماشای خواروی خۆتان بکەن، تەماشای سەروی خۆتان مەکەن، کە ئەوە دەبێتە هۆکاری بەکەم نەزانینی هەر نازو نیعمەتێك )**

---

**عَنْ أَبي آلدَّرْدَاء رَضيَ آللّهُ عنهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ آللّه ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ :**
**(( مَا مِنْ شَيْءٍ في الْميزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُق )).**
**أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالتِّرْمذيُّ، وَصَحَّحَهُ**

سبل السلام/ ج٤/ ص٣١١

**لەئەبو دەرداء دەگێڕنەوە کە سەروەر( د.خ ) دەفەرموێ:**
**( هیچ کارێك سەنگینتر نابێ لەتەرازوودا لەڕەوشت بەرزی )**





# ڕاگەیاندنی کارەساتێك لەیەکەم ساڵی سەدەی بیست و یەك لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ هەتا ١١ی ئەیلولی ٢٠٠١

سەرنووسەر

سەروتار

لەساڵانی شۆڕشی کورد کە بەشێوەیەکی زۆر سادەو ساکار لەجیهان دەگەیشتین زۆر درەنگ گوێبیستی کوشت و کوشتارەکانی کورد لەجیهان دەبوون. ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو زانستیو گەیاندن لەم ئاستەی ئەمڕۆدا نەبوو، جەنگی سارد هەبوو، بەنووسین و قەڵەم و هەڕەشە بوو، پێشبینی ئەوەشمان نەدەکرد، کە پاش تەواوبوونی ساڵانی دوو هەزار ئێمەی بێ کیان و دەوڵەت و ئاڵاو سەربەخۆیی لەلایەك و ئازا و دەوڵەمەند لەلایەکی ترەوە لەجێگای خۆمان دەبین لەپەراوێزدا کێشەکەمان باس و خواستی لەسەردەکەین و جیهان بەو شێوازە دەگۆڕێو بەهەمان کێشەی چارەنەکراو هەنگاو دەنێین بۆ هەزارەی سێیەم، ئێمە وابیرمان دەکردەوە تەنها کوردستان کێشەی هەیەو بێ چارەسەر ماوەتەوە، هەموو جیهان بەرپرسە لەزامی کوردو کۆتایی هێنان بەئازارو ئێشەکانی، بەڵام ڕووداوەکان چاوێکی تیژو سۆزێکی قوڵ و شیکردنەوەیەکی زانستیانەی فێرکردین و هەموو پەردەکانی پارە پارە کرد کە جیهان -نەوەك کوردستان- هەموو کێشەیە، رقی خوێناوییە، تۆقاندن و ترساندن و خوێن ڕێژییە، ستەم و بێ ویژدانی لەپۆپەدایە، گومان و دوو دڵیو لەیەك ترسان و توندڕەویو بەرگری لەجۆشی هەرزەکاریدایە.





مرۆڤ بەدەستی خودی مرۆڤ و زانست بەزانست لەنەمان و نقوم بوون و تێداچووندایە، هەموو دژەکان (کە نهێنی ژیان لەهاودژیدایە) هەموو خۆیان ئامادەکردووە بۆ بلاوکردنەوەی دژایەتیو یەکجەمسەری ژیان. ئێمە لەسەردەمێك دەژین ئەو رەهەندەی کە بەتەمای خۆشیو بەختیاری بووین ئەو کێشەیەمان بۆ دروست دەکات: ئایین، رەوشت، سیاسەت و زانست کە جێگەی ئومێدی مرۆڤ بووەو هەیە بۆتە جێگای پرسیار لەرۆژی ئەمڕۆدا هەموو شت بەپەلە روودەدات بەپەلە دێت، ماوەی بیرکردنەوە کەم بۆتەوە، کارەسات، ئاژاوە، جەنگ، کوشتن، ستەم، ناکۆکی جەرگبڕو توانابڕ رۆژ دوای رۆژ بەنمونەی پڕ مەترسییو توندڕەویو کارەساتی دژی مرۆڤ و سروشت و ژیان و جوانی بەرچاو دەکەوێ، ئەوە قەبارەی کێشەی جیهانەو لەئەستێرەیەکی دوورەوە تەماشا نەکراوە، لەنزیکەوە بەهەموو هەست و ئامێرەکانی هەست نیشاندەدرێ، بەلأم جێگەی ئێمە، دۆزی ئێمە لەم جیهانە ئالۆزە بۆ کوێ دەچێت و بەچی دەگات؟ ئایا لەم بارودۆخە سوود وەردەگرین ؟ وەك سوودمان لەجەنگی جیهانی یەکەم و دووەم و سێیەم کە جەنگی ساردبوو وەرنەگرت تەنها سوودمان لەجەنگی دووەمی کەنداو وەرگرت لەو دەرفەتەدا (جێگەی ئارام بۆ کورد)مان دەستکەوت، لەبەر ئەوە ئێمە پێشبینی دەکەین ئەو وێنە تاریك و تفت و تاڵەی، کە ئێستا زانایان بۆ جیهانی دەبینن بەو شێوە نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە جیهان بەرەو چارەسەرکردنی گشت کێشەکان دەڕوات و مرۆڤ بەرەو گەشەکردن و گەشبینی دەڕوات و جیهان بەرەو گیانێکی هێمن و ئارامی دەڕوات بۆ پوچەڵکردنی ئەو تیۆرانەی لەسەر قازانج و تالأنی بەکۆمەڵ دەڕوات و هێزو دەسەلأت هەموو شت نییەو زۆر هۆکاری مرۆیی لەوانە باشترە، نەتەوەی کورد لە هەردوو جەمسەری ئایین پەروەریو جیهانگیری سوودو قازانج وەردەگرێو بەشێوازێکی تازە، تەباو شاد دەبێت بەهەندێ لەمافە رەواکانی خۆیو سوود لەم بارە وەردەگرێو جارێکی تر گەلی کورد ناکرێتە قوربانی گەمەی سیاسەتی نێو نەتەوەییو دووجەمسەریو کورد مافی ناخورێ بەبیانووی کێشەی کەمتر لەکێشەکەمان کازیوە نزیکە.





# ساتێك لەسایەی قورئاندا
# راڤەی قورئان و قوتابخانەكانی‌و
# راڤەی نەوباوی مام هەژار

د: دانا شارەزوری

پێشەكی هەموو دان بەو راستییەدا دەنێین كە پاراستنی قورئان لەبەرگی كوردی زۆر تازەیەو كاردانەوەیەكی هوشیاری نەتەوایەتی‌و كوردایەتییەو بەرهەمێكی پڕ بایەخی رەوتی كوردە بەرەو سەربەخۆیی‌و شكاندنی كۆت و زنجیری پاوەن كردنی ئایین بۆ نەتەوەیەك، كە پێش كورد خەباتی سەربەخۆی‌و سەروەری‌و نیشتمانی سوودی وەرگرتوەو، نەیارانی كورد بەنیازبوون سوود لەدەقی پیرۆزو زمانی قورئان وەربگرێ بۆ پاساودانی داگیركردن و چەوساندنەوەو سەركوت كردنی كورد بەخاك و مرۆڤ و زمانەوە، بەلاّم زانای كورد زۆر زوو لەم بارەیەوە ئاگاداربوو كەوتەسەر ئەو باوەڕە كە دەبێ زمانی كورد وەك شەكرو شیر، رۆن و هەنگوین، گیان و لەش لەگەلْ قورئان تێكەلاّو بكرێ‌و بارانی رەحمەتی قورئان زمانی كوردیش بگرێتەوەو قورئان بەزمانی شیرینی پاراو، پڕ لە رەوانبێژی‌و جوانكاری‌و رێزمانی پوخت و رەسەن ئاشنا ببێت، كە رەگەز پەرستی نەیاران و كەمتەرخەمی خودی كورد بۆ ماوەی سێزدە سەدە كوردو زمانی كوردی لێی بێبەش كرابوو كار لەوانە بوو بگاتە ئەوەی كەنابێ قورئان و سروش و نیگای خوداوەند بە زمانی كوردی راڤە بكرێت. ئەو كاتەش زیانەكە چوار لایەنە دەبێ، ویستی خوداو پێغەمبەر و

ئیسلام و قورئان لەكورد بشارێتەوەو ون بكرێ، كە نەتەوەی خۆ بەخاوەن قورئانزان وازی لێهێنا كەس شارەزایی قورئان نەبێت كوردیش بێ ئاگابێت لەگەورەیی‌و شكۆو بەرزی قورئان و ئەو نەتەوەیە نەكەوێتە بەر تانەو تەشەری گەلانی موسلْمان، كە قورئان بەزمانی ئەوان نەهاتووەو شارەزاییان لەقورئاندا نییە، زیاترو زیاتر پابەندن بە بەدەقە پیرۆزەكانی قورئان. چونكە قورئان بەوەحی و سروش بۆ پێغەمبەر هاتە خوارەوەو بەزمانی عەرەبی رەوان و بێ گرێ وگۆل و پڕ لەرەوانبێژی‌و توانابڕ بە گوێ‌و هەستی دانیشتوانی مەككەو نیوەدوورگەی عەرەبی راگەیەندرا، خەلْكی سەرسامكرد بەرستەی (ان من البیان لسحراً وان من الشعر لحكمةً) كە ماناكەی وتاری رەوان لەسحرەوەو شیعر لەحیكمەتەوە نزیكەیان ناو دەبردو لەقورئاندا: ﴿كَلاَّ إِنَّهُ كَانَ لآيَاتِنَا عَنِيداً* سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً* إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ* فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ* ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ* ثُمَّ نَظَرَ* ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ* ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ* فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ يُؤْثَرُ* إِنْ هَذَا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ/ سورة المدثر-١٦-٢٥﴾ لەرووی رەوانی‌و جوانی‌و ناوەرۆك و راستی‌و رەوانبێژی‌و زمانی عەرەبییەوە، كە چلەپۆپەی گەشەكردن و







## بەنیازبوو سوود لە دەقی پیرۆزو زمانی قورئان وەربگریّ بۆ پاساودانی داگیرکردن و چەوساندنەوەو سەرکوت کردنی کورد بەخاك و مرۆڤ و زمانەوە

یەکگرتووی بەخۆیەوە بینیبوو و گەیشتبووە پلەی کامڵ بوون و پێگەیشتن و بیّ کەم و کوڕی بەهۆی ئەو خەزنە سامان و گەورەیە کە بەهۆی (قەسیدە هەڵواسراوەکانەوە) بەدەرگای کەعبەی پیرۆزو پەسند کراوی مەڵبەندی شیعرو ئەدەب و بازاڕی ساڵانەی (عکاظ) دەخوێندرایەوەو پەخش و بڵاودەکرایەوەو هەر هۆزو بنەماڵەو کۆمارێك شاعیری خۆی هەبوو شانازیو پیاهەڵدان و سوارچاکیو راو (حماسە)ی بۆ هۆزەکان دروست دەکردو چەکی بەکاری سەردەم بوو ئەوەندەی لەشیعری زەم دەترسان ئەوەندە لەشیرو تیرو کەوان ترسیان نەبوو، لەبەر ئەوە قورئان بەهەمان چەکی توانابڕو سەرنویشت ساز هاتە خوارەوە.

لەلایەکی ترەوە ئەوە دەزانین کە قورئان (کەلامی نەفسی)خودایە بۆ لەوحە (المحفوظ) لەوێشەوە بۆ فریشتەی پەیام و سروش جبرائیلی ئەمین و لەوێشەوە بۆ پێغەمبەر(د.خ) لەئەشکەوتی (حراء)و لەماوەی (٢٣) ساڵ کۆتایی پێهات و هەموو فەرمانەکانی خودا گەیشتە مرۆڤ راستەوخۆ بۆ عەرەب و بەهۆی پەرچەف و وەرگێڕانەوە بۆ گەلانی سەر زەوی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ/ سورة الروم/٢٢﴾ لەبەر ئەوە راستەوخۆ غەیرە عەرەب لەو زمانە تێناگەن دەبوو بەدوو رێگا ئەم قورئان بگاتە هەموو مرۆڤ. یەکەم: عەرەب فێری زمانی ئەو گەلە ببێت کە مەبەستە پەیامی پێبگات و لەرێگەی تەرجەمەی کاکڵەو ناوەڕۆك و مەبەستەوە بگاتە گەلانی نا عەرەب، دووەم: گەلان لەرێگەی زاناکانیانەوە فێری عەرەبی بن و قورئانە کە بەماناو مەبەست و ناوەڕۆك بگەینن بەگەلانی هاوزمان و هاونەتەوەی خۆیان، گەلان ئەوانەیان کە زووتر هۆشیاری ئیسلامیو نەتەوەیان پێگەیشتبوو رێگەی دووەمیان هەڵبژاردبوو، گەلی کوردیش یەکێك بوو لەو گەلانە کە رێگەی فێربوونی زمانی عەرەبیو شارەزابوون لەسەرچاوەی روون و سەرەتاییەوەی گرت، لەبەر ئەوە پێویست نەبوو کوردی سادە قورئان بەزمانی کوردی بزانێ، بەڵکو لەرێگەی مەلاو زاناوە قورئانی بۆ تەفسیر دەکراو هەمیشە فێری دەقی قورئان و حوکمە شەرعییەکان دەکراو پێویست نەبوو زانای عەرەب فێری زمانی کوردی ببێت و خۆ ماندوو بکات و ئەو ئەرکە شەرعیو ئایینیەی لەئەستۆی زانای کورد دانابوو بۆ ئەم مەبەستەش چەند رێبازو قوتابخانەیەك هاتە کایەوەو هەر یەکە سیماو ئاژەی تایبەتی خۆی هەبوو، لەوانەش تەفسیری قورئان بەقورئان، تەفسیری قورئان بەوشەی هاوتاو هاومانا، تەفسیری قورئان بەفەرموودەو بۆچوونی یاران و ئەو ماناو مەبەستە کە گەرماو گەرم لەپێغەمبەرو یارانەوە وەرگیراوە.

## رەگەز پەرستی نەیاران و کەمتەرخەمی خودی کورد بۆ ماوەی سێزدە سەدە کوردو زمانی کوردی لەزمانی قورئان بێبەش کرد





پاش وەفاتی رابەری خۆشەویست و شەهید بوونی زۆربەی یارانی قورئانزان خەلیفەی سێیەم قورئانی كۆكردەوەو رەوانەی شارانی كرد وەك میسر، كوفە، بەسرە، مەككەو مەدینە، ئەوكاتە قورئانی دەستنووس بەهەمە دەنگی یاران دەنووسرایەوەو پەسەند دەكراو رەوانە دەكرا كە تێیدا بخوێندرێ، پاش ئەوەی كە دەسەڵاتی موسڵمان جێگیربوو، هەموو وڵاتی دوورو نزیك كەوتە ژێر سێبەری ئیسلام و قورئان جگە لەئەركی بەرگریو سەربازیو جیهادو پاراستنی سنووری دەولەتی قورئان كۆمەڵێك قورئان خوێن و فەرمووده زان وەك فەرزی كیفایە بۆ راپەراندنی كاری رۆژانەی موسڵمانان فێری قورئان خوێندن و فەرمانەكانی شەرع و فەرموودەكانی پێغەمبەر دەبوون و پێویست نەبوو هەموو موسڵمانان سەرگەرمی ئەم ئەركە بن، ئینجا بۆ چارەسەركردنی كێشەكان و وەڵامدانەوەی پرسیارەكان لەخەڵكەوە لەم كاتەداو لەنێوان ساڵانی (٢٠-٢٥)ی كۆچی بزوتنەوەیەكی چالاك و بەهێز و بەتوانا دروست بوو لەهەموو لایەكەوە زانایان وەك ئەركی سەرشانی خۆیان و (حسبة للّه) بەچالاكیو پەرۆشەوە دابەش بوون بەسێ بەشەوە، شێوازی كاریان لەیەك جیابوو، بەڵام هەموویان بۆ خزمەت ئیسلام بوو، بۆ فێركردن و رام كردن و شارەزابوونی تازە موسڵمانەكان بوو لەنەتەوەكانی دەورو پشت.

یەكەم: بزووتنەوەی زمانەوانیو رێزمان و فەرهەنگ و پتەوكردنی زمان و (ستانداردو یەكگرتووی ئیسلامی لەسەر زاراوەكانی قورئان كە بەزمانی قورەیشی هاتبوو، ناوەندی هەردوو شاری پیرۆزو گەورەی (مكة، مدينة)بوو بەمەڵبەندی ئەم جولانەوەو لەم بارەوە خوێندنی قورئان، مانای قورئان، تەفسیری قورئان هۆكارو بۆنەی دابەزینی ئایەتی قورئان، وەرگرتنی حوكمی شەرعی دروست بوو.

دووەم: جولانەوەی پەیوەند بەفەرموودە، گێرانەوەی پلەی پیاوانی فەرموودە، بەهێزیو لاوازی گێرانەوە بناغەی ئەم جولانەوە بوو، زۆری خایاندو ماوەیەكی زۆری ویست هەتا گەیشتە كامڵ بوون و نووسینەوەو تۆماركردن لەسەردەمی ئەمەوییەكاندا.




سێیەم: بزووتنەوەی شەرعزانیو فیقهی ئیسلامیو بەراوردكردنی دەقە شەرعیو یاساییەكانی قورئان و فەرموودە لەگەڵ رووداوە نوێیەكانی دەوڵەتی بەرفراوانی ئیسلام و سیاسەتی شەرعی لەرووی خەرج و باج و داراییو ئابووریو سەربازی نوێی دەریاو وشكانیو مامەڵە لەگەڵ گەلانی تازە موسڵمان كە ناوەرۆك و كاكلەی ئەم جولانەوە لەسەر دەستی كۆمەڵێ زانای یاران و شوێنكەوتوان دەستی پێكرد، هەتا ئێرە كێشە نەبوو لەسەر هەرسێ جولانەوەكەو راوبۆچوون و تێبینیو سەرنج هەمیشە رێگەی ئاساییو یاسایی خۆی دەگرت و جێگەی رێزو قەدر بوو، هەمیشە هەموو رایەك كە دەقی لەسەر نەبووایە قابیل بوو بۆ گفتوگۆو هەمە پرسی. هەموو رایەك قابیل بوو بۆ راستیو دروستیو پێچەوانەش كێشەی زۆر لەسەر راڤەی قورئان بوو بۆ زمانی غەیرە عەرەب، كە دوو مەبەست و دوو هۆكاری لەپشتەوەیە. یەكەم:





مەبەست ئەوەیە هەموو وشەیەك رستەیەك، بگرە پیتە لێکترازاوەکانیش کە لەسەرەتای قورئانەوە هاتووە پاداش و خێری بۆ داندراوە لەحاڵەتی وەرگێڕاندا بۆ زمانێکی کە شێوازو دەنگ و ڕێزی دەشێوێ، وەك خۆی بەزاردا نایەت و کێشەی فیقهیەکەی نێوان ڕێبازی فیقهی دێتەکایەوە کە لەبریتی (بسم الله الرحمن الرحیم) وەناوی خودا کە دەهەندەو دلۆڤانە- لەنوێژو لەقورئاندا جێگەی قورئانە واجبەکە دەگرێتەوە یان نا؟

دووەم مەبەست هەندێ نەتەوە کە زمانی ئاخاوتنی خۆیان گۆڕاوەو لەرێبازو قەواعیدی قورئان نەماوە دەیانەوێ ئەم دەقە پیرۆزە نەچێتە سەر زمانی بیانیو لەسەر دەقە (عەرەبی)یەکە پارێزگاری لێبکرێو موسڵمان زۆری لێ بکرێ کە فێری ببێت و گەشە بەزمانی خۆی نەدات و نەیکاتە بەرگی قورئان. هۆکاری یەکەمیش گەلانی موسڵمانی غەیرە عەرەب ئەو ڕێبازەیان پەسەند کردوە کە قورئان توانابڕی تەنها لەدەقە عەرەبیەکە دایەو ناوەرۆکی یاساو دەستوورەو فەرزە موسڵمانی هەموو گێتی فێری ببێت. دووەم هۆکار ئەوەیە پێش هۆشیاری نەتەوەییو لەکاتی یەکگرتووی خاکی ئیسلام لەسایەی یەك دەولەتدا زمانی عەرەبی زمانی هەموو بووە، بەلام پاش ئەوەی عەرەب و تورك و فارس دەولەتی نەتەوەیی خۆیان دامەزراند ماوەی گەلی کوردیان نەدا کە ئەو خزمەتەی ئەوان بەزمانی خۆیان دەکەن بەزمانی کوردی بکرێ، بەلام خۆش بەختانە خەباتی سەختی بێ وچانی کورد بۆ پاراستنی زمان و ڕێزمان و زاراوەی ئیسلامی لەبەرگی کوردیداو توانای لە ڕادەبەدەری قورئان زانەکانی کورد بەسەر زمانی عەرەبیو کوردی وەك یەك و لەیەك ئاستدا ڕچەی ڕاڤەکردنی قورئان وەك کارێکی ئەوباوی زۆر بەنرخ و بەها هاتە کایەوە دەیان و سەدان زانا لەم بوارەدا زۆریان پێشکەش بەقورئان و زمانی کوردی کرد پیشەنگی ئەوانەش مام هەژاری شادرەوان و بوێژو شاعیرو هەستیارو خەمخۆری کوردو پیرۆز کردنی زمان لەپەنای قورئانی پیرۆزدا، لەهەموو زیاتر دلخۆشی ئێمە ئەوەیە ئەو دەنگە ناسازە کە لەهەندێ نەتەوەی ڕەگەز پەرست و خۆپەرست و ئایین و ئیسلام نەویست کە کاتی خۆی لەناو گەلی کوردو هێز و پاڵپەستۆیو بەرگری هەبوو پاش هەولی دەیان زانای وەك مەلای گەورەی کۆیەو شێخی خالی هەمیشە زیندوو و بەهەشتیو ڕەحمەتی مامۆستا مەلا عوسمان و تەمەن درێژو زانای زۆر گەورە مامۆستا مەلا کەریم، هەژاری موکریانی ناوی چووە ناو نەمرەکان وەك لەشیعرو ئەدەب و تەرجەمەو فەرهەنگ و خەباتی سیاسی پلەی گەورەی بەدەستهێنا لەم بوارە پیرۆزەش بەشی گەورەو قەوی هەیەو خوداش پاداشتی بداتەوە.

**سەدان زانا لەم بوارەدا زۆریان پێشکەش کرد بەقورئان و زمانی کوردی پیشەنگی ئەوانەش مام هەژاری شادرەوان و نووسەرو شاعیرو وەرگێڕو خەمخۆری کوردە**





بسم الله الرحمن الرحيم

﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ (صدق الله العظيم)

## هێژا جەنابی کاك مەسعود بارزانی

لەیادی پیرۆزی ئیسراو میعراج بەناوی خۆم و سەرجەم کارمەندانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پیرۆزبایی ئەم یادەوەریەتان لێدەکەین، لەخوای گەورە داواکارین ئەم بۆنە پیرۆزە ببێتە مایەی سەرفرازیو بەختەوەری بۆ سەرجەم گەلی کوردی موسڵمان ئێوەش هەر شادو سەربڵند بن بۆ رابەرایەتی کردنی گەلی کورد.

**عەدنان نەقشبەندی**
**وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی**

## بروسکەی پیرۆزبایی



﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ (صدق الله العظيم)

## بەڕێز جەنابی سەرۆك مەسعود بارزانی

بەبۆنەی هاتنی مانگی رەمەزانی پیرۆز (مانگی رەحمەت و طاعەت) گەرمترین پیرۆزبایی پێشکەش بەجەنابتان دەکەین، لەخواوەندی گەورە داواکارین لەم مانگە پیرۆزەدا تەمەنی درێژتان پێ ببەخشێت، گەلی کوردستانیش بەرابەرایەتی جەنابتان هەردەم سەرکەوتوو بێت و بەکامەرانی بژیت لەژێر سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، حکومەتی چەسپاندن و سەروەری یاسا.

دووبارە مانگی رەمەزانتان پیرۆز.

**عەدنان نەقشبەندی**
**وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی**






# ڕەنگدانەوەی سەردانە مێژوییەکەی شاندی ئەزهەری شەریف بۆ هەرێمی کوردستان لەنێوەندەکانی ڕاگەیاندنی عەرەبیدا

ڕاپۆرتی- سکرتێری نووسین

دەعوەتنامەی گەلی کوردستان بۆ ئەزهەری شەریف و سەردانی بەڕێز دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشوری وەکیلی ئەزهەر بۆ هەرێمی کوردستان و دیداری لەگەڵ سەرۆك بارزانیو سەردانی چەندین دام و دازگای هەرێمی کوردستان و ئیمزا کردنی پرۆتۆکۆلێکی مێژوویی




لەنێوان وەزیـری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی هـەرێمی کوردسـتان و وەکیلـی ئەزهـەری شـەریف جێگـای سـەرنج و گرنگـی دانـی چـەندین گۆڤـارو رۆژنامەی عەرەبیو دەزگاکانی راگەیاندنی جیهان بوو. لەم بارەیەوە یەکەمین رۆژنامە کە بابەتەکەی بڵاوکـردەوە رۆژنامـەی (صـوت الازهـر)ی کۆمـاری میسری عـەرەبی بـوو، کـە لـەژمارەی ۱۰۳ی رۆژی هــەینی ١٤ ئــەیلولی ئەمســـاڵدا لـــەژێر ناونیشـانی (وەکیلـی ئەزهەر بڕیاریدا چەند کورسییەك لەئەزهەری شەریف بۆ قوتابیـانی کوردسـتان تـەرخان بکـات) بابـەتێکی دوورو درێـــــژی بڵاوکردوەتەوەو چەند تەوەرەیـەکی گرنگـی بـاس کـردووە، کـە دەبـێ بـەخێرایی جێبـەجێ بکرێـت. لەوانـە دەعوەتکردنی شاندێکی باڵای حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و وەزارەتـی ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی لەحکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان بـۆ زیارەتی ئەزهەری شەریف و پەلەکردن لەجێبەجێ کردنی خاڵـەکانی ئـەو پرۆتۆکۆلـەی کـە لەهـەولێر ئیمزا کرابوو. هـەروەها وێنەیەکی سەرۆك بارزانی لـەکاتی پێشـوازی کـردن لـەدکتۆر مـەحمود عەبدولغـەنی عاشـور بڵاوکردۆتـەوەو، وتەیـەکی ســەرۆك بارزانیشــی بەمانشــێتی گـــەورە بڵاوکردۆتـەوە کـە دەڵێـت: سـەردانی ئەزهـەر بـۆ کوردسـتان فـەتحێکی گـەورەبوو بـۆ ئێمـە. هـەر لەبابەتەکـەدا ئامـاژە بەپـەیوەندی نێـوان سـەرکردایەتی سیاسـی هـەرێمی کوردسـتان و کۆمـاری میسـری عـەرەبی کـراوەو نووسـراوە کـە ڕێورەسمـی سـەردانی ئەزهـەری شـەریف لەلایـەن بەرپرسـانی هـەرێمی کوردسـتان و حکومـەتی میسرەوە ئامادەکراوە. هەر لەم بارەیەوە رۆژنامەی (الزمان) کـە لـە لـەندەن دەردەچێـت لـەرۆژی ٢٨ی ئابدا بابەتێکی بڵاوکردۆتەوەو لەسەر زاری سـەرۆك بارزانییـەوە لـەکاتی پێشـوازی کردنـی شـاندی ئەزهەری شەریف نووسیویەتی: خۆشحاڵین ئەمرۆ لەولاتی سەلاحەددینی ئـەیوبی پێشـوازی لـە گەلی موسڵمانی میسرو شـاندی ئەزهـەری شـەریف بکـەین. هـەروەها نووسـراوە کە ئەم سەردانەی شاندی ئەزهـەری شـەریف بـۆ هـەرێمی کوردسـتان نوێکردنـەوەی پـەیوەندی مێژوویـی نێـوان هـەردوو گـەلی

## سەردانی شاندی ئەزهەری شەریف بۆ هەرێمی کوردستان نوێکردنەوەی پەیوەندی مێژوویی نێوان هەردوو گەلی کوردو کۆماری میسرە کە لەسەردەمی بارزانی ئەمرو خوالێخۆشبوو جەمال عەبدولناسر بەردی بناغەی دانراوە

کـوردو کۆمـاری میسـرە کـە لەسـەردەمی بـارزانی ئەمرو خوالێخۆشبوو جـەمال عەبدولناسـر بـەردی بناغـەی دانـراوە. دکتـۆر مـەحمود عەبدولغـەنی عاشـور سـەرۆکی شـاندەکە دەڵێـت: ئـەوەی لەکوردستان بینیم زۆر لەوە گەورەتر بوو کە لەسەر ئـەم هەرێمـە بیسـتبووم. هـەروەها دەڵێـت چـەند زانایـەکی گـەورەی کـورد لەئەزهـەر خوێندویانـەو بڕوانامەی ئایینیو زانسـتی بـەرزیان وەرگرتـووە. هـەروەها گۆڤـاری (الأخبـار)ی میسری لـەژمارە ٢ی ساڵی یەکـەمیداو لـەمانگی ئـابی ئەمسـاڵ گرنگـی بەسـەردانەکەی شـاندی ئەزهـەری شـەریف داوەو لەگـەڵ وێنەیـەکی سـەرۆك بـارزانی ئـەم هەواڵـەی بڵاوکردۆتەوە:

لەسـەر داوای وەزارەتـی ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسلامی حکومەتی هەرێمی کوردستان شاندێکی





بالأی ئەزهەری شەریف سەردانی کوردستانی کردو لەسەر سنووری فیشخابوور لەلایەن بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیو ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئایینیو بەرپرسانی حکومی هەرێمەکە پێشوازی کران، لەسەردانەکەیدا کە شەش ڕۆژی خایاند دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشور وەکیلی ئەزهەری شەریف چەند موحازەرەیەکی لەهەرێمی کوردستاندا وتەوە، کە لەسەر داوای وەزیری ئەوقافی هەرێمی کوردستان بوو. ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)یش لەڕۆژی ٣٠ی ئابی ٢٠٠١دا بەهەمان شێوە ئاماژەی بەگرنگی سەردانەکەی شاندی ئەزهەری شەریف بۆ کوردستان کردوەو تیشکی خستۆتە سەر دیداری سەرۆکی شاندەکە لەگەڵ سەرۆك بارزانیو دواتریش مۆرکردنی پرۆتۆکۆلێکی مێژوویی لەنێوان وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ئەزهەری شەریف کە چەند خاڵێکی گرنگی تێدایەو ئێستا گەیشتۆتە قۆناغی جێبەجێ کردن. ڕۆژنامەی (الاهرام)ی میسریش کە

کۆماری میسری عەرەبییەوە، ڕادیۆی ئەوروپای ئازاد دیدارێکی لەگەڵ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی حکومەتی هەرێمی کوردستان کردووەو لەڕۆژی ٢٠٠١/١١/١١ دووجار ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی لەسەر گرنگی ئەم هەنگاوە بڵاوکردەوەو لەسەر زاری بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندییەوە گوتی: تەرخانکردنی (٤٠) کورسی بۆ قوتابیانی کورد لەئەزهەری شەریف یەکێکە لەبەندەکانی پرۆتۆکۆلی نێوان وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیو ئەزهەری شەریف کە لەدیوانی وەزارەتی ئەوقاف لەهاوینی ڕابردوو لەکاتی سەردانی شاندی کۆماری میسری عەرەبی بۆ کوردستان ئیمزا کرابوو، ئێمە خۆشحاڵین بەم هەنگاوەو هیوادارم هەموو خاڵەکانی پرۆتۆکۆلەکە لەئاییندەیەکی نزیکدا بچێتە حاڵەتی جێبەجێ کردنەوەو بۆ ئەو مەبەستەش دەعوەتنامەیەکمان لەئەزهەری شەریفەوە پێگەیشتووە تا سەردانی قاهیرە بکەین و لەوردەکارییەکانی پرۆتۆکۆلە گفتوگۆ بکەین و پەنا بەخوا هەموو بەندەکانی پرۆتۆکۆلەکە

**دکتۆر مەحمود عەبدولغەنی عاشور سەرۆکی شاندەکە دەڵێت: ئەوەی لەکوردستان بینیم زۆر لەوە گەورەتر بوو کە لەسەر ئەم هەرێمە بیستبووم**

جێبەجێ دەکرێت. ئەوەش بەدەرەجەی یەکەم لەبەرژەوەندی گەلی کوردو ئەزموونە دیموکراسیەکەیدا دەبێت. لەبەشێکی تری وتەکانی بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی بۆ ڕادیۆی ئەوروپای ئازاد ڕاپۆرتەکە گوتی: ئەزهەری شەریف گرنگییەکی زۆری هەیە، سەرۆك جەمال عەبدولناسر کاتێك قەناتی سویسی خۆماڵی کرد لەئەزهەری شەریف بڕیارەکەی ڕاگەیاند، هەروەها گوتی: بارزانی نەمر لەکاتی گەڕانەوەیدا لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق لەلایەن سەرۆك جەمال عەبدولناسرەوە پێشوازی لێکراو هەر لەو کاتەوە بەردی بناغەی پەیوەندییەکی پتەو دارێژراوەو ئێستاش سەرۆك بارزانی لەسەر هەمان ڕێڕەو گرنگی بەپتەوکردنی ئەو پەیوەندییانە دەدات.

ڕۆژنامەیەکی ناودارو بەربڵاوە لەقاهیرە دەردەچێت و لەسەرتاسەری وڵاتانی عەرەبیو جیهاندا بڵاودەبێتەوە ئاماژەی بەرەهەندەکانی سەردانەکەی شاندی ئەزهەری شەریف بۆ کوردستان کردووەو پێشینەیەکی مێژوویی لەژمارە (٣٨٣٩)ی ڕۆژی ١٦ی ئەیلولی ئەمساڵدا لەسەر پەیوەندی دۆستانەی نێوان گەلی کوردو گەلی میسر نووسیووە. هەر لەم بارەیەوەو دوای ڕاگەیاندنی قبوڵ کردنی (٤٠) قوتابی کورد لەزانکۆی ئەزهەر لەلایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی



# تـــــــەجرید و تـــــــەئویل
# لــــــە دەقــــى قورئـــــــاندا

**ن: ئەکرەم عەنەبی** — **١ لە ٣**

بێگومان هەر دەقێکی پیرۆز دوو جۆر گوتار (خطاب) لەخۆی دەگرێت و بونیادی گشت دەقەکان ئەم دوو جۆرە گوتارەیە، کە گوتاری گەردوونیو مێژوویین. بەهۆی پەیوەندی پتەوی هەردوو چەمکی تەجریدو تەئویل لەگەڵ ئەم دوو جۆرە گوتارەدا پێش چوونە نێو باسەکە شرۆڤە (شرح) کردنی گوتارەکان بەپێویست دەزانم:

گوتاری گەردوونیو مێژوویی دەقی پیرۆز بەپابەند بوون بەدیاردەو شتە دەرەکییەکانی زمانەوە دێتە ئاراوە، واتە بەهۆی پابەندبوون بەشوێنکات (زمکان)و پاشهاتەکانی ئەوانەوە، بەم واتایە گوتاری مێژووی دەقی پیرۆز گشت ئەو ئایەت و سورەتانە دەگرێتەوە کە لەژێر کاریگەری رووداوەکانی شوێن و سەردەمە دیاریکراوەکاندان و خودی سیاقی گوتارەکانیش -ئایەتەکانیش- بەراشکاوانە لەو رووداوە دەدوێت و نەبۆتە گوتارێکی گشتگیری گەردوونی، بۆ نموونە پابەند بوونی قورئانی پیرۆز بەشوێن و سەردەم و کەسانێکی دیاریکراوە وە -لەهەندێ ئایەتدا- کۆمەڵێك گوتاری مێژوویی خوڵقاندووە، کە دەتوانین لەناوهێنانی کۆمەڵێك کەس و شوێنی دیاریکراو -بەچاك و خراپەوە-و رووداوی تایبەتدا بیانخەمەروو[2] هەرچی گوتاری گەردوونی کتێبی پیرۆزە پابەند نییە بەهیچ لەشتە دەرەکییەکانی زمانەوە و کاریگەری شوێنکات و کۆمەڵگەی لەسەر نابینرێت. دەتوانین لەقورئانی پیرۆزدا سەدان ئایەت بەنموونە بهێنینەوە کە جەخت لەسەر گەردوونی بوونی گوتارەکان دەکەنەوەو لەچوارچێوەی مێژوو و جوگرافیای تایبەت دەچنە دەرەوە، ئایەتی سەرەتای سورەتی (البقرة) که دەفەرموێت: ﴿الم * ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ/١-٢﴾ بەتەواوی لەشوێنکات دابڕاوەو گوتارێکە بۆ گشت گەردوون، تەنانەت هێندە گەردوونییە لەسنووری مرۆڤیش دەچێتە دەرەوە، چونکە (متقين) مەرج نییە تەنیا مرۆڤ بگرێتەوەو بەپێی سەرچاوەکانی فەرموودە دەکرێ جنۆکەش (متقي)یان تێدابێت.

لەلایەکی دیکەوە گوتاری گەردوونی لەمەسەلە جەوهەرییەکانی ئایین دەدوێت و تارادەیەکی زۆر بەپێچەوانەوە گوتاری مێژوویی لەمەسەلە لاوەکییەکانی ناجەوهەرییەکان دەدوێت، هەر بۆیەشە دەکرێت بەتێپەڕینی کات و گۆڕانی شوێن وەك دەقێکی مێژوویییان لێدێت و لەگۆڕانە خێراکانی گەردوون و مرۆڤدا ئامادە نابن، بۆ نموونە سورەتی (مسد) که باس لە(ابولهب)ی مامی پێغەمبەر(د.خ) دەکات ئەمڕۆ وەك مێژوو، یاخود دروستتر ئەوەیەکە وەك تەفسیرێك بۆ ئایەتە گەردوونیو جەوهەرییەکانی دیکە بەرچاو دەکەوێت.

پاش ئەم روونکردنەوە کورتە سەبارەت بەگوتاری گەردوونیو مێژوویی پێویست دەکات هەردوو چەمکی تەجریدو تەئویل و پەیوەندیان بەم گوتارانەوە روونبکەینەوە:

تەجرید بەواتای داڕنین یاخود رووتکردنەوەی زمان/ دەق دێت لەگشت کاریگەرییە دەرەکییەکانی دیکەی وەك کات و شوێن و کۆمەڵگەو.. هتد، ئەم




دارنینەش بردنەوەی دەقە بۆ نێو سیستەمی زمان و دارنینەتی لەپێشهاتە مێژووییەکان. دەکرێت تەجریدو تەشخیص ـ دەستنیشانکردن ـ بەدوو زاراوەی دژ یەك دابنێین، چونکە هەمیشە تەجرید لەو فەزایەدا گەشە دەکات کە سنووردارکردن و دەستنیشانکردن رۆڵی کارایان لەدەست دابێت.

**تەئویل و وشەی تەئویل لەمێژووی ئیسلامیدا رووبێکی گەشی وەرنەگرتووەو هەمیشە کە باس لە پرۆسەی تەئویل کراوە بیروهزر بۆ تێکەڵاو کردنی هەواو هەوەس چووە بەدەقە قورئانییەکان**

بێگومان قورئانی پیرۆز خاڵی نییە لەتەجریدو تەشخیص، ئایەتی زۆر بەرچاو دەکەون کە بەموجەرەدی دابەزیون و بەخوێندنەوەیان هزری خوێنەر بۆ هیچ رووداوو بەسەرهاتێکی دەستنیشانکراوو دیار ناچێت و تەنیا وەك دەقێکی موجەرەد یاخود یاساییەکی بریار لەسەردراو وەردەگیرێت. دەبێ ئەو راستییە بزانین کە هەمیشە تەجرید لەنێو سیستەمی زماندا پیادە دەبێت و بەچوونەوە نێو سیستەمەکانی دیکەی کات و شوێن و کۆمەڵگە ئیدی بوارێك بۆ تەجرید نامێنێتەوە. بەڵام دەسنیشانکردن (تشخیص) هەمیشە بە بەستنەوەی زمان بەسیستەمەکانی دیکەوە دروست دەبێت و مانا دەسنیشانکراوەکان لەدەرەوەی سیستەمی زمانەوە بەسەریاندا دەسەپێنرێت. لەراستیدا مرۆڤ هەمیشە مەیلی بەلای دیاری کردن و سنووردارکردنی موجەرەدەکانەوەیە، بۆ نموونە دوو ئایەتی موجەرەدی وەك ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ * صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ/ سورة الفاتحة/٦-٧﴾ تا ئەوپەڕی موجەرەد خاڵییە لەهەر ئاماژە (ئیشارە) یەکی دیاریکردن. بەڵام مرۆڤەکان ـموفەسیرەکان ـ هەوڵیان داوە بەم چەند شێوەیە دەسنیشان (تشخیص)ی بکەن:ـ

١ـلێکدانەوەی (صراط المستقیم) بەسیستەمی ئیسلام ئایینی پیرۆزی دابەزیو بۆ سەر محەممەد(د.خ).

٢ـ(انعمت علیهم) بەموسڵمانانی پابەندو شوێنکەوتەی قورئانی پیرۆز.

٣ـ(المغضوب علیهم) جولەکە.

٤ـ(الضالین) گاور.

لەراستیدا خودی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەهیچ شێوەیەك ئەم جۆرە دەسنیشانکردنانەی لێناخوێندرێتەوەو بەشێوەیەکی موجەرەد مرۆڤ داوا دەکات کە بۆ سەر رێگای راست هیدایەت بدرێت، کە رێگەی نیعمەت پێدراوانەو غەزەب لێگیراو گومڕا نەبێت.

ئەم مەیلەی مرۆڤ بۆ دەسنیشانکردن و دیاری کردنی چەمکەکانی زۆر جار لەو روانگەیەوە سەرچاوە دەگرێت، کە مرۆڤ هەمیشە حەزی لەسادە کردنەوەی ئاڵۆزەکان و رووناککردنەوەی تاریك و لێڵەکانە، خودی تەجریدی دەقیش بەلای مرۆڤەوە یەکێکە لەگەورەترین ئاڵۆزو تاریك و لێڵەکانی دەق. بەڵام بۆ خودی دەقی پیرۆز مایەی پاراستن و مانەوەی و نەفەوتانیەتی، چونکە موجەرەد پابەندی سیستەمەکانی دەرەوەی زمان نابێت، بە تێپەڕینی کات ماناکانی کۆن نابێت یاخود لەدەستیان نادات، هەروەها بەگۆڕانی شوێن و کۆمەڵگەش معالیمەکانی کاڵنابنەوە.

پەیوەندییەکی زۆر پتەو لەنێوان تەجریدو وتاری گەردوونی لەلایەکەوەو تەشخیص و گوتاری

مێژوویی قورئان لەلایەکی دیکەوە هەیە. چونکە گوتارە گەردوونییەکانی قورئان پایەندی شوێنکات و کۆمەڵگا نابن، دەکرێ بڵێین ئەم دووانە (گوتاری گەردوونیو تەجرید هاورێکن و بەهەمان ئاراستەی یەکدی گوزەردەکەن و زۆربەی دەقە جەوهەرییەکانی قورئان بەموجەرەدی باسکراون و فاکتەرەکانی وەك کات و شوێن و کەس و کۆمەڵگەو. . هتد کاریگەریان لەسەریان نییە. بۆ نموونە لەسەرەتای سورەتی (البقرة)دا کاتێك باس لە(متقین) دەکرێت بە شێوەیەکی موجەرەدە، وەك دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ* وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ/ سورة البقرة/٣-٤﴾ ئاشکرایە سیماکانی لەخواترسی (متقی) مەسەلەیەکی زۆر جەوهەری ئایینە، خوداش کە لەم دوو ئایەتەدا باسیکردووە، بەشێوەیەکی زۆر موجەرەدەو نەیفەرمووە (عەمرو زەیدو. . هتد) لەخواترس، بەڵکو تەنیا سیماو ئادگارەکانی لەخوا ترسی خستۆتە روو.

ئەم شێوە موجەرەدەیە کە قورئانی پیرۆز ناکاتە دیلی دەستی رۆژگارو نابێتە مایەی گۆڕان و فەوتاندنی -هەرچەندە خودای گەورە خۆی پەیمانی پاراستنی داوە- چونکە ئایەتە موجەرەدەکان لەگشت سەردەم و شوێنێکدا خوێندنەوەیان بۆ دەکرێت و بەشێوەیەکی دیارو دەستنیشانکراو دانەبەزیون، کە هیچ خوێندنەوەیەکیان بۆ نەکرێت.

هەرچی گوتارە مێژووییەکانە زۆر دەستنیشانکراون بۆ نموونە: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ* مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ* سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ* وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ* فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ/ سورة المسد﴾ هێندە دەستنیشانکراوە هیچ خوێندنەوەیەك هەڵناگرێت جگە لەوەی (پیاوێك هەبوو لەمەککەدا ناوی ئەبو لەهەب بووە مامی پێغەمبەر(د.خ) بوو ئەم پیاوە ئازاری پێغەمبەری دەداو ژنەکەشی درکی دەخستە بەرپێی خوداش غەزەبی بۆ قەراردان).

لەراستیدا ئەم دەستنیشانکردنە لەقورئاندا مەسەلەیەکی جەوهەری نییە، چونکە بەسەدان زاڵم و ستەمکاری دیکەی وەك ئەبو لەهەب و بگرە ملهوڕتریش هەبوون، بەلام قورئانی پیرۆز بەم شێوە دیارو دەستنیشانکراوییە لێیان نەدواوە (لەبەر ئەوەی کرۆکی باسەکەی ئێمە موجەرەدە درێژە بەباسی تەشخیص و وتاری مێژوویی نادەین).

لەسەرەتاوە وتمان تەجرید بەواتای داڕنین یاخود روونکردنەوەی زمان/ دەق دێت لە گشت کاریگەرییە دەرەکییەکانی دیکەی وەك کات و شوێن و کۆمەڵگەو. . هتد ئەم داڕنینەش بردنەوەی دەقە بۆ نێو سیستەمی زمان و داڕنینیەتی لەپێشهاتە مێژووییەکان. لێرەدا دەبێ باس لەو پرەنسیبە بکەین، کە دەق لەنێو سیستەمی زمانیدا لێکدەداتەوە، بەو واتایەی کاتێك ئێمە لەو باوەڕەداین دەقە داڕنراوەکانی قورئان پەیوەست نین بە شوێن کاتێکی دیاریکراوەو لەچوارچێوەی پێشهاتە شوێنکاتییەکاندا خوێندنەوەی دروستیان بۆ ناکرێت ئەوە پێویستە لەو پرەنسیبە بگەرێین کە دەقی داڕنراو (مجرد)ی پێدەخوێندرێتەوە.

گەر لەپێناسەی تەئویل وردببینەوە کە بریتییە لە(خوێندنەوەی دەق لەنێو سیستەمە دەلالییەکانی زماندا) ئەوا راستەوخۆ پەی بەو نهێنییە دەبەین کە پێویستە لەدووی بگەرێین. بەر لەوەی بچینە سەر باسکردنی تەئویل و ئەو رێچکەیە لەخوێندنەوەی دەقی موجەرەددا، پێویستمان بەم روونکردنەوەیە دەبێت:-

تەئویل و وشەی تەئویل لەمێژووی ئیسلامیدا رووبێکی گەشی وەرنەگرتووەو هەمیشە کە باس لەپرۆسەی تەئویل کراوە بیروهزر بۆ تێکەلاو کردنی هەواو هەوەس چووە بەدەقە قورئانییەکان، ئەم باکگراوندە (خلفیە) نەمێژووییە -کە رەنگە پاساوی لۆجیکی خۆیی هەبێت- وای کردووە کە





هەر کاتێك قسە لەتەئویل کراوە بەشێوەیەکی بەر بڵاو دژایەتی چەمکەکەو پەیڕەوکارانیشی کراوە، تەنانەت ئەو زانا بەرزانەی تەئویلیشیان کردووە – بەواتا سەردەمییەکەی واتە خوێندنەوەی ئایەتە موجەڕەدەکان لەنێو سیستەمی زماندا– دانیان بەوشەکەدا نەناوە، وەك زانای پایە بەرز –فەخری رازی[٣]– بەڵام لەراستیدا تەئویلی دروست ئەو دێوەزمە ترسناکە نییە، کە ببێتە مایەی تێکەڵاوکردنی هەواو هەوەس بەئایەتەکە. هەر وەك چۆن پێغەمبەر(د.خ) دوعای بۆ (ابن عباس) دەکردو دەیفەرموو {اللهم فقهه في الدين وعلمه التأويل}.

گەر تەجرید دارێنیی دەق بێت لەسیستەمە دەرەکییەکان ئەوا خوێندنەوەی ئەو دەقە بەسیستەمە دەرەکییەکان کارێکی مەحاڵ دەبێت، چونکە دەکرێت سورەتێکی وەك (مسد) بەسیستەمە دەرەکییەکانی وەك مێژوو، تایبەت بەکەسێکی دیارەوە راڤە بکرێت و لێکبدرێتەوە، بەڵام سەدان ئایەتی دیکە کە ئاماژە بەرووداوێك یاخود کات و کەس و شوێنێکی دەسنیشانکراو ناکەن لەسیستەمە زمانییەکەی خۆیدا نەبێت لێك نادرێتەوە. من پێم وایە دەقی موجەڕەد تەئویل دروستدەکات نەوەك تەئویل ببێتە مایەی دروستکردن و شێواندنی دەق، خودی دەقی موجەڕەدیش یەکێکە لەسیما هەرە دیارەکانی دەقی قورئان و ویستی خوداو (مەشیئەتی ئیلاهی) خۆشی ئەوەی خوڵقاندووە، کە دەقی قورئانی پیرۆز بەموجەڕەدی چنراوە. هەر ئەم موجەڕەدەشە بووەتە مایەی هاتنە ئارای هەموو ئەو تەفسیرە جیاوازانەی کە تەنیا –لەهەندێ حاڵەتدا– ناویان تەفسیرە ئەگەر نا لەجەوهەرو کرۆکیاندا تەئویلێکی جیاوازن بۆ دەقە موجەڕەدەکانی قورئان، چونکە هیچ کام لەتەفسیرەکان لەکاتی راڤەکردنی سورەتی (مسد)دا جیاوازیان نییە، بەڵام لە راڤەکردنی ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ/ سورة الفاتحة/٧﴾ دا جیاوازییەکی زۆریان هەیە. بەدی کردنی ئەم جیاوازییە لەئایەتە موجەڕەدەکاندا خۆی لەخۆیدا بەڵگەی ئامادەیی پرۆسەی تەئویل بووە لەسەر دەمە جیاوازەکانی مێژووی ئیسلامیدا.

چونکە گەر لەتەفسیرە جیاوازەکان وردببینەوە راڤەی ئایەتێکی موجەڕەدی وەك ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ/ سورة ال عمران/١٩﴾ دا چەندین رای جیاوازمان سەبارەت بەوشەی (الاسلام) بەرچاو دەکەوێت بەم شێوەیە:–

> **کێشەکەمان بەدووبارە کردنەوەی ناکۆکییەکانی رابردوو چارەسەر ناکرێت، بەڵکو بەهەوڵدان بۆ خوێندنەوەیەکی زانستیانەی دەقەکانی قورئان دەگەینە چەندین راستی پەی پێنەبراوی نێو دەقەکان**

(قرطبي)(ر.خ) لەراڤەکەیدا دەڵێت: (ئاین لەم ئایەتەدا بەمانای گوێڕایەڵی و ملکەچی دێت و ئیسلامیش بەواتای ئیمان و گوێڕایەڵییەکان)[٤].

(الطبرسي)(ر.خ) لە(مجمع البيان فى تفسير القران)دا دەڵێت: (مەبەست لەئیسلام خۆ دانەدەست خوداو پیاو چاکەکانی خودایە، کە ئەویش باوەڕهێنانە)[٥].

(السيوطى)(ر.خ) دەڵێ: ((عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن جەریر لەقتادەوە لەسەر (ان الدين) دەڵێت: ئیسلام شەهادەی (ان لا اله الا الله) یە باوەڕ هێنانە بەوەی لای خوداوە هاتووە، ئەویش ئەو ئایینەیە خۆی دایدەبەزێنێت و پێغەمبەری پێ رەوانە دەکات و رێگەی وەلییەکانی بۆ رووناك دەکاتەوە))[٦].

(سيد قطب)(ر.خ): ئیسلام بەیەکتاپەرستیو قەوامە دەداتە قەڵەم[٧].

(البروسوى)(ر.خ): لە(روح البيان)دا پێی وایە





هیچ ئایینێك خودا رازی ناكات جگە لەئیسلام كە یەكتا پەرستی‌و لەسەر شەریعەتی دروست رۆیشتنە ئەویش ئایینی راستە لەو كاتەوەی ناردووە.. . حەقیقەتی ئایینی ئیسلامیش یەكتا پەرستییە[8].

(عەلامە طباطبائي)(ر.خ): پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت كە ئیسلام خۆدانە دەست و تەسلیم بوونە بەحەق و راستی كە ئەویش راستی باوەڕهێنان و راستی كردارە، یاخود بەمانایەكی دیكە خۆ دانەدەست ئەو بەیانەیە كە لەمەقامی پیرۆزی پەروەردگارەوە دەردەچێت[9].

(ابن عطیة الاندلسی)(ر.خ) دەڵێت: ئیسلام مانای ئیمان و گوێڕایەڵییە[10].

هەروەها (الثعالیبي)[11]یش هەمان رای (قرطبی‌و الاندلسی) دووبارە دەكاتەوە. رایەكی دیكەی راڤەكاران لەبارەی وشەی (الاسلام)ەوە بریتییە لەوەی كە پێویستە وشەكە وەك سیفەت و ناو لێكدی جودا بكرێنەوە، چونكە وەك سیفەت دەدرێتە پاڵ گشت ئەوە خودا پەرەستەكان، بەڵام وەك ناو تەنیا ناوی ئایینی دابەزیووە بۆ سەر پێغەمبەر(د.خ)، هەموو خوێندنەوەكانی سەرەوە جگە لە رای (قرطبي واندلسي وثعالیبي) كە لە(قرطبي) وەرگیراوە هاوشێوەن ئیدی جیاوازییەكی بەرچاو بەدی دەكرێت و جیاوازیەكانیش لەزمانەوە سەرچاوە دەگرن.

لەراستیدا ئەمڕۆ كێشەكەمان بەدووبارە كردنەوەی ناكۆكییەكانی رابردوو چارەسەر ناكرێت، بەڵكو بەهەوڵدان بۆ خوێندنەوەیەكی زانستیانەی دەقەكانی قورئان دەگەینە چەندین راستی پەی پێنەبراوی نێو دەقەكان. ئیدی ئەو خوێندنەوەیە لە ژێر ناوی تەفسیردابێت (وەك زانا رابردووەكان كردیان) یاخود لەژێر ناوی تەئویل دابێت (وەك رێڕەوێكی زانستی نوێ) گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە لەو راستییە بكۆڵرێتەوە كە دەقە موجەرەدەكانی قورئان بەسیستەمە دەرەكییەكانەوە پەیوەست نین و پێویستە لەروانگەیەكی دیكەوە كە جیاواز بێت لەو سیستەمانە بخوێندرێتەوە. چونكە بێگومان چەندین هۆكار بۆ موجەرەد بوونی دەقی قورئان لەئارادایە كە بەپشتیوانی خودا لەداهاتوودا لێی دەدوێین.

## پەراوێز:

١. لەراستیدا ئەم باسە چەندین تەوەرەی جیاوازی لێ جودا دەبێتەوە كە بەپێی توانا هەوڵدەدەین لە سێ تەوەرەدا لێی بدوێین، بەشی یەكەمی بریتییە لەتەجریدو تەئویل لەقورئاندا. بەڵام هەرچی بەشی دووەم و سێیەمە كە مێژوو هۆكارەكانی بوونی تەجریدو بەراوردی كتێبە پیرۆزەكانە لەرووی موجەرەدییەوە بەپشتیوانی خودا لەداهاتوودا لێیان دەدوێین.

٢. لەراستیدا ئەم باسە بۆ ئەو مەبەستە تەرخان نەكراوە، بۆ زیاتر روونكردنەوە بڕوانە، گوتارە مێژووییەكانی ئاڤێستا، ن.ئەكرەم عەنەبی، گۆڤاری ژیار، ژ. ٨، ل ١٠٥.

٣. ئێمە لێرەدا نامانەوێت بچینەوە نێو ئەو جەدەلەی كە ئایا تەئویل چاكە یاخود خراپەو كێ تەئویلی قورئان دەزانێت و كێ مافی تەئویلی هەیە. دەكرێ بۆ زانیاری زیاتر خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ ژمارە (٢)ی گۆڤاری ژیار كە مەلەفێكی تایبەت بەتەئویلی تێدایە، بەتایبەتی باسی (ئایا تەئویلی قورئان تەنیا خودا دەیزانێ، ن.بەهائەددین خورەمشاهی. و.دیدار كەریم، ژ.٢، ٢٠٠٠، ل١٠٣).

٤. قرطبی، الجامع الاحكام القران، ط١٠، ج٢، ل١٣٤.

٥. الطبرسي، مجمع البيان في تفسير القران، ج٢، ل٢٥٩.

٦. السيوطي، الدر المنثور، ج٢، ل١٦٦-١٦٧.

٧. سيد قطب، في ضلال القران، ج١، ل ٣٨٠.

٨. البروسوي، تفسير روح البيان، ج٢،ل١٣.

٩. طباطبائي، الميزان في تفسير القران، ج٣و٤، ل١٣٩.

١٠. ابن عطية الاندلسي، المحرر الوجيز، ج١، ل٤١٣.

١١. ثعاليبي، جواهر الحسان، ج١، ل٢١٤.





# لە سەلاحەددینی ئەیوبی بۆ میرنشینەکان و هەنگاوێکی نیشتمانی بەرەو سەدەی بیستەم و خەباتی بارزانی نەمر!

حیکمەت کەریم

ئەگەر سەیری ئەو ناونیشانەی سەرەوە بکەین و بەوردی تێی بڕوانین دەبینین چەند سەردەمێك و چەند بۆچوون و بیرکردنەوەو، سەرکەوتن و رووخان، بەردەوامی‌و خزمەتکردن لەرێگەی ئیسلام و خزمەت بۆ ئیسلام و رووخان بەناوی ئیسلام و مانەوە لەئیسلام بەدی دەکەین، کە میللەتی کورد لەپێناوی بەرز راگرتنی ئەم ئایینە پیرۆزە هەوڵی بۆ داوە، هەروەها غەدرو کوشتن و بڕین و ئەنفال، دەرکردن و خاك داگیرکردن و جیا کردنەوەی منداڵ لەدایك و باوك و ئافرەت بێوەژن کردن بەناوی ئیسلام و لەپەنای پیرۆزی ئیسلام لەکورد کراوەو، بقەو وەهمی دوور لەواقعی ئیسلام کورد بۆ خۆی دارشتووەو پیلانەکانی دوژمنانی جێبەجێ کردووە بێ ئەوەی بۆچوونە وەهمییەکان بەبیرێکی زانستیانە هەڵسەنگێنن، بۆیە نەیانتوانیووە لەبەردەم میرو شاو سوڵتانەکانی بەناوی ئیسلام کە غەدریان لێکردوون بوەستن، چونکە بە کفرو دەرچوون لەشەرعیەت و ئایین لەقەڵەمیان داوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەزاناو مەلاو شێخەکانی تێکەیشتووی کورد بەردەوام خەباتیان کردووەو میللەتەکەیان لەهەڕەشەکانی دوژمن پاراستووە، کە هەریەکە بەپێی تواناو بیرو بۆچوون و سروشت و سنووری جوگرافی خۆی لەناو کوردستان لەبەرامبەر دوژمنان وەستاوەو دەستی داگیرکەرانی بڕیووە، بۆیە مێژووی گەلەکەمان لەم بارەیەوە قوربانییەکی زۆرمان دێنێتەوە یاد کە لەپێناوی ئیسلام و خاکی کوردستان و کوردایەتی‌و مەنزلگاو رزگاری‌و ئازادی‌و بەرزراگرتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی داوە، هەروەها ئەو قوربانیانەی دەستی خیانەت و خۆفرۆشی‌و دەسەڵات و ئاغایەتی‌و پارەو عەشیرەت و ناوچەگەری‌و میرایەتی‌و میرات و براکوژی‌و غەدر، شەڕی بێگانان وەکو سەفەوی‌و عوسمانی‌و حکومەتەکانی چواردەور، تاڵان و سەفەرو کۆچ و راکردن و هێرش بردن، جینۆسایدو ئەنفال و کیمیایی‌و.. دێنێتەوە یاد.

ئەم ناونیشانەی سەرەوە سێ ماناو چەمکمان بەدەستەوە دەدات و سێ ماوەی زەمەنی دیاردەخات کە هەریەکە بەشێوەیەك بۆ مەبەستێك خەباتی تێدا کراوە، لەهەر سەردەمێك جۆرە قوربانییەکی تێدا دراوەو فکرەیەك باڵی بەسەر هەر ماوەیەك لەماوەکان داگرتووەو جۆرە دەسەڵاتێکیش حوکمی کردووە، بۆیە وەهمێکی نائومێدی بەرۆکی گەلەکەمانی گرتووەو ترسی بقەیی




دەرووونی داگیرکردوون، لەگەڵ ئەمەشدا بابەتەکەمان لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە بەدەستی کورد قودس رزگار کراو و گەورەترین هێزی جیهانی تێکشکێنرا، لەپێناوی بەرز راگرتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، گەلی کورد قوربانییەکی زۆریدا لەبەرەنگار بوونەوەی لەگەڵ گەورەترین سوپای جیهانی، ئەمەش بەسەرکردایەتی سەلاحەددینی ئەیوبی کوردی بوو، عەرەب و ئەوانەی عەرەبیش نەبوون لەژێر چەتری دەسەڵاتی ئەودا بوون. لەم کاتەشدا چەمکی نیشتمانیو نەتەوەیی لەدایک نەبووبوو. هەموو خزمەتێکی گەلانی موسڵمان بۆ ئیسلام بوو و لەبەرژەوەندی ئایینی ئیسلام بووە، سەلاحەددین هەموو ئەو گەلانەی لەژێر چەتری سەرکردایەتی ئەو بوون بەیەکسانیو بێ جیاوازی نەتەوەیی

**لە پێناوی**
**بەرز راگرتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، گەلی کورد قوربانییەکی زۆریدا لەبەرەنگار بوونەوەی لەگەڵ گەورەترین سوپای جیهانی، ئەمەش بەسەرکردایەتی سەلاحەددینی ئەیوبی کوردی بوو**

چاولێدەکرد، ئەگەرچی هەندێک پەنجەی تاوانی بۆ درێژ دەکەن و بەچاوی ئەمڕۆ سەیری سەردەمی سەلاحەددین دەکەن و هیچ کاتێک هەوڵیان نەداوە خۆیان بخەنە ناو قاڵبی ئەم سەردەمەو بەچاوی ئەم رۆژە لەواقیعەکە بڕوانن. چونکە (هەندێک لەمامۆستایانمان و رۆشنبیرانی کورد هەروایان لەئێمە مانان گەیاندووە، پاساویشیان ئەوەیە گوایە سەلاحەددین هیچی بۆ نەتەوەکەی خۆی نەکردووە). لەم کاتە ئەم سەردەمە لێکدەنەوە بۆیان دەردەکەوێ، کە ئەویش خزمەتی گەلەکەی کردووەو دەوڵەتێکی ئەیوبی دامەزراندووە، کە نزیکەی هەموو سەرکردەکانی کورد بوونەو، پێویستە ئەمڕۆ ئێمەی کورد شانازی بەو قارەمانییەتییە بکەین. د.ئەلمانع لە چاوپێکەوتنێکی راستەوخۆی کەناڵی ئاسمانی (اقرا) کە دکتۆرێکی پسپۆری مێژووە لەزانکۆکانی سعودیە ((جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە هەموو بەڵگەنامە مێژووییەکان دەیسەلمێن دەوڵەتی ئەیوبییەی سەلاحەددین دەوڵەتێکی کوردی ئیسلامی بوو، کە چەندین بەڵگەشی بۆ سەلماندنی بۆ چوونەکەی هێنایەوە، بۆیە پێویستە شانازی بەدەوڵەتە کوردییەکەیو سەلاحەددین بکەین بەتایبەتی ئەمڕۆکە دەبینین هەموو وڵاتانی ئیسلامیو هەموو هێزو دەسەڵاتەکانی عەرەب وەکو سەلاحەددینیان پێ ناکرێو خەون بەسەلاحەددینێکی دیکەی کوردی دەبینن بۆ رزگار کردنی قودس، کە ئەوخەونە سەرابییەی ئێستایان مندالآنی فەلەستینیان بۆ رزگار ناکات، بۆیە ئەو بەردانەی دەستی منداڵەکان بەرووی دوژمنان نییە، بەڵکو بەرووی عەرەبە دەسەڵاتدارەکانی دەهاوێژن و هەر بەردێک لەعنەتێکی بەدواوەوەیە، کە بۆچی سەلاحەددین جارێک قودسی لەبەرامبەر




گەورەترین هێزی ئەم سەردەمە رزگار کردو ئێوە پێتان ناکرێ؟ سەرەڕای ئەمەش خەونە وەنەوشەییەکانی نەوەکانی سەلاحەددین زیندە بەچاڵ دەکەن. راستە سەلاحەددین بۆ خزمەتی نەتەوەو میللەتەکەی خەباتی نەکردووە، بەڵام بەناوی رۆلەیەکی گەلی کورد سەرکردایەتی هەموو گەلانی ئیسلامی کردووەو بنەمایەکی مێژوویی چاندوە، کە ئەمڕۆ نەتەوەپەرستە عەرەبەکان بەهەموو هەوڵەکانیان پەردە پۆشکردنی کوردینی سەلاحەددینیان پێناکرێ. لێرە مەبەست نییە ئەم سەردەمەی سەلاحەددین و مێژووەکەی باس بکەین. بەڵکو کورد لەم سەردەمە لەبەرزترین دەسەلاتیدا هەوڵی خۆ سەپاندنی نەداوەو ئاڵای پیرۆزی ئیسلامی بەرز راگرتووەو هەموو ئایینەکان بە ئاسوودەیی لەژێر چەتری ئەم سەرکردە کوردەی موسڵمان بەخۆشی ژیاون.

ئەگەر لەدوای سەلاحەددین هەنگاوێکی فراوان بهاوێژین و بۆ سەردەمی میرنشینەکان بچین دەبینین هەر میرنشینێك لە سنوورێکی دیاری کراو حوکمی ناوچەکەی کردووەو دەسەلاتی لەم چوارچێوە رەت نەکردووە. ئەگەر هەوڵیشیان دابێت سنووریان فراوان بکەن ئەمە بۆ ئارەزووی تایبەتی میرەکان بووەو هیچ مەبەستێکی نیشتمانی تێدانەبووە، تەنها مەبەستیان خۆ نیشاندانی دەسەلات بووە بەسەر میرەکانی تر، بەڵام ئەگەر سەیری کارو کردەوەکانی میرنشینەکان بکەین هەوڵێکی سەرەتایی نیشتمانیان لێ بەدی دەکرێ لەچوارچێوەی ئەو مەنزڵگایەی کە ناونراوە میرنشین، بۆیە هەریەکە لەمیرنشینەکان بەپێی تواناو فراوانی هێزی میرەکان لەم سنوورەی حوکمیان کردووە بنەمایەکی نیشتمانی ساکاریان داکوتاوە، بەڵام وەکو بیرۆکە نەبووەو بەڵکو هەوڵدانێکی خۆشەویستی مەنزڵگا بووە بۆ پاراستنی ئەو سنوورەی لەژێر دەسەلاتیاندا بووە، ئەگەر سەیری میرنشینەکان بکەین و بەوردی تێی بڕوانین بۆمان دەردەکەوێ کە میر محەمەدی میری سۆران سەربەخۆی راگەیاندووەو سکەی بەناوی خۆی لێداوەو سوڵتانیەتی عوسمانی پێی قبوڵ نەبووە، میرنشینی بابان و ئەردەلان بایەخێکی زۆریان بەئەدەب و شیعرو زانست و رۆشنبیری داوە کە ناوچەکەیان پێشخستووە، لە ئەردەلان بیناسازی سەردەمیانەو پێشکەوتوو بایەخیان زۆر پێداوە، میر بەدرخان میری جەزیرە هەنگاوێکی زۆر فراوان و پیرۆزی هاویشتووە کە هەوڵی داوە میللەتی کورد هەمووی لە چوارچێوەی (پەیمانی پیرۆز) کۆبکاتەوەو سوپایەکی بەهێزیان لێ دروستبکات، تا لە هەرەشەو مەترسییەکان یەکتر بپارێزن، کەچی زۆربەی میرەکان بەپیرییەوە نەچوون لەبەر خۆشەویستیان بۆ

## میرنشینی بابان و ئەردەلان بایەخێکی زۆریان بەئەدەب و شیعرو زانست و رۆشنبیری داوە کە ناوچەکەیان پێشخستووە





دەســـەلات و قبـــولْ نــەكردنی ئــەوی تــر، ئەگینا یەكەم هەنگاوی یەككرتوویی و دەسەلات فراوانــی گــەلی كــورد دەبوو. لەگەلْ ئەوەشـدا بـــیری نەتـــەوەیی لەمیرنشـینەكان بـەدی نـــاكرێت، چونكـــە هەروەكو سـەردەمەكەی سەلاحەددینی ئـەیوبی باســـی نەتـــەوەیی و نیشتمانی لەفەرهـەنگی میرنشینەكاندا نـەبووە، بـــەلام هـــەولْیانداوە خۆیـــان و هـــۆزو ناوچـــەیان لــــە هەرەشـەكانی دوژمنـان بپارێزن و دادپەروەری و ئاســـایش و ئـــارامی بخەنـە ناوچـەكانی ژێـر دەسەلاتیان و بیرۆكـەی خۆشەویستی و ئینتمـا بــۆ خاكەكـــەیان لای میللەتەكــە دروســـت بكـــەن، لــــەو خۆشەویســـتییەی بــۆ مـــەنزلْگاو ناوچـــەو شـــارەكەیان ببێتـــە بنەمایـــەكی قوولْـــی خۆشەویســـتی بـــۆ نیشتمان.

لەسـەدەی بیستـەمدا، بەتایبەتی بارزانی نەمر خۆشەویســتی هـــەموو خـــاكی كوردســـتان لەدەروونی میللەتەكەی كۆكـردەوەو فراوانـتری كرد.

لەسـەرەتای سـەدەی بیستەم و دوای جەنگی جیـهانی یەكــەم بـیری نیشـتمانی و نەتـەوەیی بـــەروونی بـــەدی دەكرێـــت و گـــەلی كوردیـــش هـــەولْی رزگـــاركردنی خـــاكی ولاتـی لەژێر دەسـەلاتی داگیركـــەران دەدات، هەروەها لەم سەدەیەداو لەهـــەر پارچەیـــەكی كوردستان بیرو بۆچوون و روانگـەی جۆراوجـۆر بـۆ رزگـاركردن بـەدی دەكرێـت، دوژمنـانی كورد چۆن هەولْیانداوە كـــورد بـــۆ مـــەرامی نەتـــەوەیی خۆیـــان بەكاربـهێنن و لــەكاتی دەســەلاتیش ئـازادی كوردیان داگیر كردووەو كوردیـــــــــــان چەوسـاندۆتەوە ئـەوەتا جەواهێر لال نـەهرۆ لـە نامەیـەكیدا بـۆ ئـەندێرە گـاندی كچـی خـۆی نووســیوە و دەلْــیْ: (كــەمال پاشـا پــاش شۆرشــی ســالْی ١٩٢٥ كوردەكـانی لـەناوبردو دادگـــای تایبـــەتی سەربەخۆی بۆ دادگایی كردنــی كوردەكـــانی دانـــاو بەهـــەزارانی فـەرمان بەسـەردا دان و هـــەردوو ســـەركردەی كـورد شـێخ سـەعیدو دكتـــۆر فوئـــادو زۆری تری حوكم دا، ئەوانەی مـــردن و ئـــاواتی ســـــــــەربەخۆیی كوردستانیان بەرنەدا... بەم جۆرە ئەو توركانـە بـۆ رزگـاری خۆیـــان دەجەنگان، سەری ئـەو كوردانـەیان پـانكردەوە كــە داوای ئازادییـــان دەكرد... چەند سـەیرە لــــــــەپارێزگاری نیشـــتمانەوە بكاتـــە پـەلاماری نەتـەوەیێكی دیكــەو داگـــیركردنی ئـازادی لێـی...) بـەلْیْ میللەتی كوردیش وەكو هـەموو میللـەتانی تـر، بـەلْكو پـتریش هـەولْی داوە ئازادی دەسـتەبەر بكـــات و لەهـــەموو بەشـەكانی كوردســتان شـۆرش ئـەنجام دراوەو بـــەپێی قـــەبارەی شـۆرشـەكان هـەندێك

> **لەسەرەتای سەدەی بیستەم و دوای جەنگی جیهانی یەكەم بیری نیشتمانی و نەتەوەیی بەروونی بەدی كراوو گەلی كوردیش هەولْی رزگاركردنی خاكی ولاتی خۆی لەژێر دەسەلاتی داگیركەراندا**





مافی بەدەستهێناوە، تا بەوە ڕاگەیشتووە لە ناوچەی سلێمانی شێخ مەحمود سەربەخۆی ڕابگەیەنێت و لە کۆنگرەی پاریسیش شەریف پاشا هەوڵی بەدەستهێنانی چوارچێوەی دەوڵەتێکی کوردی لەسەر خاکی کوردستان بووەو واژوو لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان بۆ ئەم مەبەستە کۆکرایەوەو هەوڵەکان سەری نەگرتووە، لەناوچەی بارزانیش بەهەمان شێوەی ناوچەکانی تر یاخیبوون و بەرنگار بوونەوەو شۆڕش ئەنجامدراوەو هەوڵی فرەوانبوون و هاوکاری کردنی ڕاپەڕین و شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی تر لەناوچەکانی کوردستانیان کردووە، بۆیە ئەگەر سەیری بنەماڵەی بارزانی بکەین دەبینین هەر لە سەرەتاوە هەوڵیانداوە ڕێگەی ئازادیو دادپەروەریو ئازادی ڕادەربڕین لەبەردەم خەڵکەکە والأبکەن، لەسەردەمی شێخ عەبدولسەلام بارزانی هەنگاوی زۆر ئیجابیانە هاوێشتراوەو دەرەبەگایەتی لە ناوچەکەی نەهێشتووەو زەوی بەسەر جوتیارەکان دابەش کردووە تا هەریەکە بتوانێ خۆی بەڕێوەببات و بەری ڕەنجی نێوچەوانی خۆی بخوات و نەبێتە داردەستەی کەس هەروەها مافی ئافرەت، بەڵکو گشت تاکێکی ناوچەکەی پاراستووەو مارەییو بەزۆر بەشوودانی ئافرەتانی قەدەغە کردووە، هەر گوندێکیش لیژنەیەکی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری گوندەکە دامەزراندووە، لەگەڵ ئەم هەموو کارەش خەڵکەکەیان فێرکردووە ژێر دەستی قبوڵ نەکەن و هەردەم بەئازادی بژین، لەهەمووی گرنگتر یەکگرتووی خەڵکی ئەو ناوچەیە بووە، کە هیچ کاتێك پشتی یەکتریان بەرنەداوە، ساردیو گەرمیو برسێتییان پێکەوە چێشتووە، جیا لە هەموو شێخەکانی تر لە جیاتی ژیان لە کۆشك و تەلاری سەخت بەسەر بەرن لەناو میللەتەکەیان ژیاون و هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵیاندا نەبووە.

لەسەردەمی شێخ ئەحمەد بارزانیش ناوچەکەی پاراستووەو ڕێگەی دەست درێژی دوژمنانی بڕیووە، هەروەها لەسەر کارەکانی شێخ عەبدولسەلام بەردەوام بووەو پەرەی پێداوە، سەرەڕای ئەمەش هاوکاری ناوچەکانی تری کردووە لەبەر پەرچدانەوەی دەست درێژی دوژمنان هەروەکو هاوکاری بۆ شێخ مەحمودی حەفید ڕەوانەکردووە هەروەها بەخۆیو برا بچووکی بارزانی نەمرو هۆزەکەی چوونە کوردستانی ڕۆژهەلأت و پاڵپشتییەکی زۆر بەهێزی کۆماری مەهابادیان کردووە، کە لەڕووی ئازایەتی ئەو ناوچەیە دوژمنان پێش دۆستان پەنجەی گەواهی بۆ قارەمانیەتی خەڵکی بارزان درێژدەکەن، کە زۆر ئازایانە بەرگریان لەخۆیان کردووەو گەورە هێرشەکانی زەمینیو ئاسمانی دوژمنانیان تێکشکاندووەو تا مۆڵگەکانی خۆیان ڕاویان ناون و بەتفەنگە کۆنەکانیان فڕۆکەی جەنگیان خستۆتە خوارەوە، لەڕووی ئایینیەوە بنەماڵەیەکی شێخ و لەسەر تەریقەی نەقشبەندین، هەردەم پەیڕەوی ڕێنمایی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان کردووەو بەنرخترین پەرتووك لایان قورئانی پیرۆزە، کە ئیلهامی ئازایەتیو پاراستنی خاکی ولأت و دوژمن شکاندنیان لێ





وەرگرتووە، روحی تەسامحیو برایەتیو پێکەوە ژیانیان فێری خەڵکەکە کردووە، لەگەڵ ئەمەشدا نەیانکردۆتە وەسیلە بۆ خۆ پێکەیاندن، بەڵکو هەوڵیانداوە ئالأی پیرۆزی ئەم ئایینە بەبەرزی بمێنێتەوەو پاراستنی ولأتیش لەئەرکە پیرۆزەکانی ئیسلام فێری خەڵکەکە بکەن و ڕێکەشیان لەبەردەم ئەوکەسانە، گرتووە کە لەپەنای ئیسلامەوە غەدر لەمیللەتەکەیان بکەن. ئەوەتا سەرۆك بارزانی لەچلەی شەهید فەرەنسۆ هەریری دەڵێت: (من پەیڕەوی شێخ ئەحمەدی بارزانیم، مەزهەبمان شافیعییە، تەریقەتمان نەقشبەندییە، کەس لەخۆم بەموسڵمانتر نازانم، کەسیش لەپارتی لەپێشتر نابێ بۆ بەرگری لەئیسلام، لە هەمان کاتیشدا کەس لەپارتیو لەئێمە توندتر نابێ بەرامبەر بەو خائین و ڕووڕەشانەی دینیان کردووە بەوەسیلەیەك بۆ ئەوەی هەرچی بەکاسبی ناشەرعییە لەدونیا دەستیان بکەوێ). بەڵێ خۆیان لەپێشەوەی پارێزەرانی بەرگری لەئیسلام دادەنێن و بەکردەوەو راستیش هەر لەپێشەوە بوون.

بارزانی نەمر پتر لەسێزدە ساڵ لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو مایەوەو خەڵك دوور بەدووری کاریگەری ئەم ئایدۆلۆجیایەیان لەسەر دەنیشت، کەچی بارزانی نەمر ئەو ماوە درێژە لەناویان ژیانی بەسەربرد بۆ ساتێکیش نەتەوەکەیو مافەکانی میللەتەکەیو خۆشەویستی خاکەکەیو ئایینەکەی لەبیر نەچۆتەوە، بەڵکو دینەکەی بەبەرزی ڕاگرت و بەردەوامیش بوو لەسەر مافەکانی میللەتەکەیو لەدوای گەڕانەوەشی بۆ ولأت، بینی دوژمن لەسەر کەللەرەقی خۆی بەردەوامە، گەورەترین شۆڕشی لەمێژووی گەلەکەمان بەرپا کردو دوژمنانی هێنا سەر بارێك کەدان بەمافی ڕەوای گەلەکەمان لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بێنن، بەڵێ شۆڕشی ئەیلولی مەزن بەسەرکردایەتی بارزانی نەمر ماوەیەکی زۆری خایاندو چۆکی بەدوژمن داهێنا، ئەگەر پیلانی نێودەوڵەتی نەبووایە زۆر سەخت بوو دوژمن بتوانێ لەبەرامبەر شۆڕشەکە بوەستێت، چونکە شکەستەکانی حکومەت وەك مانگی چواردە دیارو ئاشکرابوون.

**بارزانی نەمر پتر لەسێزدە ساڵ لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو مایەوە کەچی بۆ ساتێکیش نەتەوەکەیو مافەکانی میللەتەکەیو خۆشەویستی خاکەکەیو ئایینەکەی لەبیر نەچۆتەوە، بەڵکو ئایینەکەی بەبەرزی ڕاگرت و بەردەوامیش بوو لەسەر مافەکانی میللەتەکەی**

بارزانی نەمر لەم شۆڕشەدا هەموو چین و توێژەکانی کوردستانی لەیەك سەنگەر کۆکردەوەو جیاوازییەکانی

ناوچەیی‌و کارو پیشەو، هەژاری‌و دەوڵەمەندی، خاوەن بروانامەی بەرزی خوێندن و نەخوێندەوار، ئیسلام و مەسیحی‌و یەزیدی، مەزهەبی‌و عەشیرەتی، لەنێوان خەڵکی کوردستان نەهێشت و هەمووی کردن بەبراو ئامانجیان رزگارکردنی کوردستان و وەدەرنانی داگیرکەر بوو، هەروەها تۆی نەتەوەیی‌و دڵسۆزی‌و خۆشەویستی لەناو میللەت چاندو ئەمڕۆ وا بەرهەمەکەی دەخۆین و پەرە بەخەبات و ماندووبوونی بارزانی‌و هاوڕێبازانی دەدەین، سەرکەوتنەکان رۆژ لەدوای رۆژ لەژێر سێبەری کابینەی چوارەمی حکومەتی هەرێم سەقامگیرتر دەبێ، بەتایبەتی ئەو سیاسەتە حەکیمانەی ئەمڕۆ پارتی گرتویەتیەبەر کە پەیڕەوی رێبازی سەرۆکی روحی نەتەوەکەمانە، سەرۆك بارزانی لەرۆژی چلەی شەهید فەرەنسۆ ئەو حەقیقەتە روون دەکاتەوە کە ئەو کەسانەی هەوڵدەدەن پارتی لەئیسلام جیابکەنەوە زۆر هەڵەن، چونکە زۆر بەروونی بەو کەسانە دەڵێت کە ئایین دەکەنە وەسیلە بۆ بەدەستهێنانی مەکسەبی ناشەرعی کە پارتی زۆر بەتوندی بەرامبەریان دەوەستێت و دەبێتە پێشەنگی بەرپەچ دانەوەیان و پارێزگاری کردن لەئیسلام، لەهەمان ئەم چوارچێوەیە نەتەوەیی خۆیان جێبەجێ دەکەن و خاکی وڵات دەپارێزن، بۆیە پێویستە هەر کەسێکی خۆی بەدڵسۆزی خاك و نەتەوەکەی بزانێت (پاراستنی کوردستانێکی فرە حزبی‌و فرە نەتەوەیی‌و فرە ئایینی ئەرکی سەرشانی هەموو حزب و لایەن و هەموو وڵات پارێزێکە، ئێمە لەمێژوودا بەوە سەربەرزین، کە کوردستان جێگەی فرە ئایینی بووە ئێستاش جێگای فرە ئایینی‌و فرە حزبییە)و پاراستنی نەتەوەیی‌و خۆفیداکردن لەرێگای خاك و نەتەوە لەئەرکە هەرە سەرەکییەکانی ئیسلامەو مێژووی گەلەکەشمان زۆر لەو سەرکردە زانایانەی ئایینیمان دێنێەوە یاد، وەکو: شێخ عوبێدوڵڵای نەهری‌و شێخ عەبدولسەلام بارزانی‌و شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدی بارزانی‌و قازی محەممەدو مەلا مستەفای بارزانی، کە ژیانیان پڕە لە سەروەری‌و گیانفیدایی لەرێگای ئازادی گەلەکەیان.

## سەرچاوە


١. بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد، نووسینی رێزدار مەسعود بارزانی هەردوو بەرگ.

٢. گوڵان ژمارە ٣٢٤ لە ٥/٤/٢٠٠١ وتاری بەرێز بارزانی لەچلەی شەهید فەرەنسۆ هەریری.

٣. کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

٤. پێشکەوتن ژمارە ٧٤-٨٣ بارزانی وەکو سەرکردەیەکی مەزن- نووسینی سوار قامشلی.

٥. گوڵان ژمارە ٣٢٤ لە ٥/٤/٢٠٠١ باسێك لەکورد و تەعریب، موژدەیەك بۆ سەرسام لە نووسینی عەبدولڕەزاق عەلی.





کوردستان لانکی دووەمی مرۆڤایەتییە

# داستانی نەورۆز لەنێوان نوح و ئیبراهیمدا

(سەلامی خوایان لێ بێت)

هەموو گەلێکی زیندوو خاوەنی ئەفسانەو داستانی تایبەت بە خۆیەتی، کە لەشێوەی چیرۆك یان شیعر یان چیرۆکە شیعرەوە داڕێژراوەو، باس لەڕووداوێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایینی یان دەروونی ئەو نەتەوانە دەکات. بەهەمیشەیی ئەم ئەفسانانە دەگەڕێنەوە بۆ چاخە تاریك و کۆن و ون و زۆر دوورەکانی پێش زایین، کە مەگەر هەر لەلاپەڕەکانی ناو ناخ و خەیاڵ و زەیندا جێگەیان بووبێتەوە. چونکە ئەم ئەفسانانە کەمتر دەتوانن بەقاڵبە ئەفسانەییەکەیانەوە خۆیان لەواقیعدا بنوێنن. کە بەمەرجێك وەك لای زانا مێژووییەکان دەرکەوتووە، هەموو ئەفسانەیەك راستەو لەواقیعدا روویان داوە. بەڵام بە هۆی دەماو دەم و دووری کات و جێگەی خەیاڵ و نەبوونی نووسین و خوێندەوارییەوە، کەم و زیادی بۆ کراوەو دەستی تێخراوەو بووەتە ئەفسانە، هەتا نەمرێت و لەبیر نەچێتەوەو رووداوەکە بەزیندوویی‌و بەرجەستەیی بهێڵرێتەوەو، گوڕ بەمانەوەی بدات، دەرکەوتووە کە هەموو ئەفسانەیەك رەگێکی مێژوویی‌و رووداوێکی واقیعیان لەسەر زەوی بووە، هەندێك پێیان وایە کە بەکارهێنانی ئەفسانە، مانای بەپێزکردن و درێژەپێدانی رووداو دەبەخشێت، هەتا کاری نووسەر گەورەترو چڕ ترو تەمەن درێژتربێت. بۆچوونێکی تر دەڵێت، لەو سەردەمانەدا نەتوانراوە گەلێك شت بە ئاشکرا بدرکێنرێت، مەترسی ئەوەکراوە خاوەن داستان توشی گرتن و لەناوبردن ببێت، بۆیە پەنایان بردوەتە بەر ئەو رەمزو هێمایانە کە ئەفسانە ئامێز بێت و مەبەست بپێکێت، نەبێتە گرفت بۆ نووسەرو ئەوەی دەیگێڕێتەوە.

ـ هەر میللەتێك خاوەن داستان و ئەفسانەی خۆیەتی، ئەلیازەو ئۆدیسەی ئەغریق و گلگامشی ئەکەدی‌و مهاربهارتاو رامیانەی هیندی‌و ئەنیازەی ئیتالی‌و جست و رۆلآنی فەرەنسی‌و ئیکوری روسی‌و شیرین و خەسرەو و شیرین و فەرهادی فارس و لەیل و مەجنونی عەرەب و مەم و زین و کاوەو زوحاك و نەورۆزو دەیانی تری کوردی.

ئەگەر سەیری ژیانی سەرەتای مێژوو، پێش دامەزراندنی شارستانی بکەین. کاتێك مرۆڤ بیری لەبوون و گەردوون و ژیان و مردن و رووداوە نادیارەکانی سروشت و دەوروبەری کردۆتەوە، ئەوەندە سەخت و دژوارو گرێیاوی هاتونەتە پێش چاوی، لەئاستیدا دەستەوسان و حەپەساوو وەستاوەو، ناچار پەنای بردۆتەبەر خەیاڵ و ئەفسانە بۆ لێکدانەوەیان، مرۆڤ خۆشی هەمیشە حەزی بەترشی‌و خوێ و رازاندنەوەو گەورەکردن و پێوەنان و خەیاڵ و ئەفسانە پۆشییە، تا مەبەستەکانی بەئاسانی لەهۆش و هەست و





مێشکی خەڵکیدا جێ بکاتەوە. چونکە هەتا خەیاڵ پۆشتربێت، خۆش و بەتام و چێژترە، گرنگترین قوتابخانەی مێژوویی لای وایە، کە ئەفسانە چیرۆکێکە باسی هەندێ رووداوی گرنگی مێژوویی دەکات کە پەیوەندی بەژیانی گەلەکەوە هەبووە، لەترسی لەبیرچوونەوە بەهەندێ دەسکاریەوە خراونەتە قەوارەی چیرۆك ئامێزی رەونەقدار. کاوەو نەورۆز یەکێکە لەبەهێزترین و گرنگترین ئەفسانە کوردییەکان، کە رەنگە لەسەردەمێکی زۆر کۆنی پێش زایندا روویان دابیو، دوورو درێژی رۆژگارو زەمانە کردونیەتە ئەفسانە. (کاوەو فەرەیدون) نەورۆزیان هەڵبژاردو شۆڕشەکەیان تێدا بەرپاکرد، حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) رۆژی نەورۆزی هەڵبژاردو بتەکانی تیا شکاند، چونکە لەو یادەدا پاشاو گەدا هەموو شاریان چۆڵ کردووە، چوونەتە دەرەوە بۆ سەیران. کەواتە نەورۆز لەسەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر کۆنترە، ئەی دەبێ نەورۆز لەچییەوە هاتبێو هی چ سەردەمێك بێت؟ هەردەبێ رووداوێکی زۆر گرنگ بەرپابووبێ کە هەموو گەلەکان تیا بەشداربووبن، چونکە نەورۆز لەئاسەوارەکانی بابلیو فیرعەونە میسریو سۆمەرییەکانی (٤٥٠٠ پ.ن)دا هەیە، واتە زۆر لەسەردەمی ئیبراهیمیش کۆنترە. هەیە نەورۆز دەباتەوە سەر دەوڵەتی پێش داوی یان سەردەمی جەمشیدو هۆشەنگ و کیومەرس، کە دیارە لەوانیش کۆنترە. زەردەشتییەکان کیومەرس بە باوکی مرۆڤایەتی دەزانن و لەئاوێستادا ناوی هاتووە، سەردەمی کیومەرس زۆر دوورەو لەمێژوودا بە(مێژووی چاخە ئەفسانەییەکان) ناسراوە، واتە سەردەمی پێش مێژوو، کە رووداوەکانی لێڵ و تەمو مژاوین و مێژووەکەی ونە، دوای کیومەرس، هۆشەنگی کوڕی هاتە جێیو پاشتر جەمشید هات. نەورۆز لەسەردەمی هۆشەنگ و جەمشیدا یاد دەکرایەوەو بووبوو بەجەژن و سەری ساڵیان. زۆر لەوە دەچێ کە کیومەرس خۆی (نوح) پێغەمبەر بێت، یان کوڕی ئەو بێت، کەواتە رووداوەکە هی سەردەمی نوح پێغەمبەرە، گرنگترین رووداوی سەردەمی نوح تۆفانە، کە ئاسەوارە سۆمەرییەکان بەدوورو درێژی باسیان کردەوەو، پاشتریش لەئاوێستاو ئینجیل و تەورات و قورئاندا باسکراوە، وا دیارە نەورۆز هی سەردەمی نوحەو مەبەست لەرووداني تۆفانەکەی نوح بیو جەژنی رزگاربوونی ئەو گرووپە بێ کە لەگەڵی دابوون لەو کەشتییەداو، لەسەر شاخی (جودی) لەخاکی کوردستان دابەزین. مرۆڤ دوو قۆناغی مرۆڤایەتی بووە بەگوێرەی هەر چوار نامە ئاسمانییەکان کە باسکراون: قۆناغی یەکەم لەئادەمەوە (سەرەتای یەکەم مرۆڤەوە) دەست پێ دەکات، هەتا سەردەمی بەپێغەمبەر بوونی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دوای ئەوەی خەڵکی باوەڕی نەهێنا. جگە چەند کەسێك- نوح داوای کرد رزگاریان بکات، خوا داوای کرد کەشتیەك دروست بکەن، سواری کەشتی بوون، ئەو گروهە کەمە رزگار بوو، ئەوانی تر هەموو مردن و خنکان. ئەو کەشتییە (واستوت علی الجودی) لەسەر شاخی جودی لەنگەری گرت و دابەزین، جودی دەکەوێتە خاکی کوردستان لەزنجیرە چیای ئارارات، وشەی (جودی) لەئەسڵدا

**کاوەو نەورۆز یەکێکە لەبەهێزترین و گرنگترین ئەفسانە کوردییەکان، کە رەنگە لەسەردەمێکی زۆر کۆنی پێش زایندا روویان دابیو، دوورو درێژی رۆژگارو زەمانە کردونیەتە ئەفسانە**





(گودی) بووه، خوا بۆ عەرەبەکانی باس دەکات لەقورئاندا. لەعەرەبیدا (گ) نییەو دەبێتە (ج). سەر زەوی تەنها ئەوانەی لەکەشتیەکە رزگاریان بوو تیابوو، ئەوانە بوونە (نەواتی) مرۆڤایەتی، لەقۆناغی دووەمی مرۆڤایەتیدا، ئەو گەلەی کە لەدەوری شاخی گودی زۆربوون بەناوی کێوەکەوە ناونران (گوتی)، پیتی (د)و (ت) لەیەکەوە زۆر نزیکن و ئەلۆمۆرفی یەکترین و شوێنی دەرچوونیان لەزار یەکە، گەلی گوتی بە یەکەم وەچەی کورد دادەنرێ کە لەخاکی کوردستاندا زۆربوون و ژیاون و بلاٌوەیان کرد، واتە کوردستان بووبە (لانکی دووەمی مرۆڤایەتی)، ئەو رۆژی دابەزینە، بووە جەژن و هەموو ساڵ یاد دەکرایەوە، بووە رێکەوت و مێژووی لەسەر دیاری دەکرا بەناوی (مێژووی دوای تۆفان). وەك چۆن بەلەدایك بوونی عیسا پێغەمبەر (مێژووی زایین)و، بەکۆچکردنی محەممەد پێغەمبەر لەمەککەوە بۆ مەدینە (مێژووی کۆچی) دروست بوو، هەریەکەیان بەرهەمی رووداوێکی گرنگن. چی لەرووداوی تۆفان مەزنترو کاریگەرتر بووە کە سەر لەنوێ ژیانی گۆڕی، شارستانی گۆڕی، جۆری بیرکردنەوەی گۆڕی، هەروەك خاکی گۆڕی، دابەزینی کەشتی رۆژێکی نوێ بوو بۆ ئەوانەی لەناوی دابوون، لەبەر ئەوە ناونرا (نەورۆز) رۆژی نوێ -واتە ژیانێکی نوێ- سەردەمێکی نوێ، خاکێکی نوێو شارستانیو بیرکردنەوەیەکی نوێ، کە هیچ لەوی پێشووتر نەدەچوو، نوح باوکی گەلانە کە لەدوای تۆفانەوە دروست بووە، هەر بۆیە جەژنی نەورۆز لەلای سۆمەریو بابلیو میسریو فینقییەکان یادکراوەتەوەو، تایبەت نەبووە بەیەك میللەت، بەلاٌم مادام لەخاکی کوردابووە، پشکی زۆرتر بەر گەلی کورد دەکەوێ.

نێوانی (نەورۆز)و (کاوەو زوحاك) زۆرە پەیوەندیان بەیەکەوە نییە، هەر ئەوەندەیە، کە

**کاوەو فەرەیدون هی کوردەو جەژنی تایبەتیەتی، بەلاٌم نەورۆز جەژنی گەلانەو کوردیش پشکی زیاتری بەردەکەوێت**

کاوەو فەرەیدون شۆرشەکەیان لەو یادەدا کردووە، هەر وەك چۆن ئیبراهیم پێغەمبەر لەو یادەدا بتەکانی شکاند.

کاوەو فەرەیدون هی کوردەو جەژنی تایبەتیەتی، بەلاٌم نەورۆز جەژنی گەلانەو کوردیش پشکی زیاتری بەردەکەوێت.

لێکۆڵینەوەی زیاترو قووڵتر دەتوانێ چاکتر ئەوانە بسەلمێنێو، کوردستانیش لانکی دووەمی مرۆڤایەتییە، واتە لەقۆناغی دووەمی مرۆڤایەتیدا، مرۆڤەکان لەکوردستاندا زۆر بوون و بەهەموو لایەکی سەر زەویدا بلاٌوبوونەوەو، هەتا ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە..

## سەرچاوەکان:


١. کاوەو نەورۆز لەنێوان ئەفسانەو ئاین دا، حسن محمود کریم ١٩٩٨ سلیمانی.
٢. گۆڤاری رامان ژمارە ٤٦ ساڵی ٢٠٠٠ لاپەرە (٣١-٤٥).
٣. التوراة من ادم حتی سبی بابل، محمد قاسم محمد/ ١٩٩٢، قطر.
٤. مروج الذهب، المسعودی، ج١، لاپەرە ٥٣.
٥. القران الکریم، سورة (العنکبوت، الاسراء، نوح).
٦. مقدمة ابن خلدون، ابن خلدون، بیروت/ ١٩٨٥.
٧. نوروز، ثورة کاوة الحداد، محمد توفیق وردی، مطبعة الحدیثة/ ١٩٧٣.
٨. داستانی نەورۆز، حیلمی علی شریف، بغداد/١٩٩١.





# وەقف لە مێژوودا

سیروان ئەحمەد

هەوڵدانی مرۆڤ بۆ نزیک بوونەوە لە خوای خۆی و رازی کردنی هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە خولیای بووە، هەر بۆیە شێوازی جۆراوجۆری گرتۆتەبەر لەم پێناوەداو، ئەوەی خۆشی ویستووە لەم رێیەدا دایناوە هەر لەچاکە کردنی رۆژانەوە تادەگاتە گیان بەخت کردن، لەم رووەشەوە جیاوازی نەبووە لەنێوان کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو، هەر لە هۆزەکانی ئەفریقیاوە دەست پێدەکات تادەگاتە پایتەختی شارستانیە پێشکەوتووەکان، بەڵام هەریەکەیان بەشێوازی خۆیان.

خۆشەویستی موڵك ومالْ، غەریزەیە لە مرۆڤدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا/ سورة الكهف-٤٦﴾ بۆیە کاتێك مرۆڤ دەست لەماڵ و موڵك یان بەشێکی هەڵدەگرێت، مانای ئەوە دەگەیەنێت کەچاوەڕوانی پاداشتێکی گەورە تر دەکات، بیروباوەڕی خۆی پێ پتەو دەکات، رۆحانیەتی خۆی پێ گەشە دەدات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ / سورة التوبة-١٠٣﴾ وەقفیش لەبنەڕەتدا جۆرێکە لەمامەڵەکردن بەموڵکەوە. وەقف وەك وشە پەیوەستە بەموسڵمانانەوە، بەڵام وەك مانا پەیوەستە بە هەموو گەلانەوە هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە تا بەئەمڕۆ دەگات، چونکە هیچ نەتەوەو گەلێك بێ پێغەمبەر یان ئاگادارکەرەوەیەك نەبووە: ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلا خَلا فِيهَا نَذِيرٌ/ سورة الفاطر-٢٤﴾،

فەیلەسوفی ناسراو (هنری برگسۆن) دەڵێت: "کۆمەڵگەی مرۆیی هەبووەو دەشبێت بەبێ زانست و هونەرو فەلسەفە هەڵبکات، بەڵام هەرگیز بێ ئایین نەبووە"[1] مێژوونووسی کۆنی گریگ (بلوتارك)یش دەڵێت: "لەمێژوودا شار بووە بێ شورەو بێ قوتابخانەو بێ کۆشك، بەڵام شاری بێ پەرستگا نەبووە"[2]، ئەگەرچی زۆرێك لەو ئایین و بیروباوەڕانە لەراستە رێی خۆیان لادراون، بەڵام ئەگەر بۆ مەبەستی دنیایش بووبێت ئەوا ئەو پەرستنش و رێوشوێنە ماڵیانە پیادەکراون، هەروەك چۆن لەسەردەمی جاهلیەتدا بۆ مەبەستی شانازی کردن بەکارهاتووە.

لێرەوە وەقف بەشێوەیەك لەشێوەکان بەر لەئیسلامیش بووەو تاکە زامنی بەردەوامبوونی کارە خێرخوازییەکان بووە، ئەگەرچی بەناوو مەبەست و مانای تارادەیەك جیاوازیش بووبێت، دیارترین ئەو وەقفانەش کە تائێستاش ناسراوو ماون و دەگەڕێنەوە بۆ بەر لەئیسلام وەقفی حەزرەتی ئیبراهیمە (رەزای خوای لەسەر بێت)، ئێستاش تیشك دەخەینە سەر چەند لایەنێکی وەقف لە پێش ئیسلامدا:

## وەقف لەمیزۆپۆتامیا

خەڵکی ئەم ناوچەیە لەسەردەمی بابلییەکاندا چەند جۆرێك مامەڵەی ماڵیان زانیووە کە لەشێوەی وەقف دەچێت وەك مافی سوودمەندێتی، بەشێوەیەك (پاشا) هەندێ لەزەوییەکانی دەبەخشییە کارمەندەکانی کە دەیانتوانی بەهەموو شێوەیەکی رەوا ئیستغلالی بکەن، بەڵام بەبێ ئەوەی موڵکیەتەکەیان بۆ بگوێزرێتەوە یان مافی فرۆشتنیان هەبێت، یاساش رێگەی دەدا ئەم مافی سوودبینینە بەچەند مەرجێك بۆ وەرەسە بگوێزرێتەوە.




## وەقف لای میسرییە كۆنەكان

فیرعەونەكان هەندێ لەموڵكەكانی خۆیان وەقف دەكردو داهاتەكەشی خەرج دەكرا بۆ گیان و گۆڕو پەیكەرەكانیان، ئەمڕۆ لەموزەخانەی میسردا هەندێ تابلۆ هەن كە ئاماژەیان پێدەكات، لەدەقی بەڵێننامەی یەكێك لەشازادە فیرعەونییەكانی رۆژانی وەچەی دوانزەهەمدا هاتووە: كە بۆ كاهینی پەیكەرێك لەپەیكەرەكانی صەعیدی میسری نووسیووە. هەروەها رەمسیسی دووەمیش موڵكێكی زۆری بەپەرستگای (ئەبدرۆس) بەخشیووە، بەرستشیش ئەنجام دراوە لەكاتی گواستنەوەی موڵكەكان بۆ پەرستگاكان، ئەمەش وای لەخەڵك كرد تاشوێن پێی هەڵنەگرن.[3] (بنوت) كە یەكێكە لەفەرمانڕەواكانی وڵاتی (نەوبە) لەسەردەمی رەمسیسی چوارەمدا -هەروەك شوێنەوارە میسرییەكان ئاماژەی پێدەكەن- زەوییەكی تەرخان كردووە تا بەداهاتەكەی هەموو ساڵێك گوڵكێك بكڕدرێت و بۆ گیانەكەی سەرببڕدرێت.[4]

هەروەها سیستمی تەولیەشیان بەسەر وەقفەكانیانەوە زانیووە.

## یۆنان

شوێنەوارە یۆنانییەكان ئاماژە بەوە دەكەن كە ژنێك بەناوی (ئەریتی) باخچەكەی خۆی تەرخانكردووە لەسەر شاری (ئۆكۆستنیس) تا پەرستشی ئایینی تێدا ئەنجام بدرێت، سەركردەیەكی یۆنانیش بەناوی (نسیاس) زەوییەكی بۆ ئیقامەكردنی پەرستش بۆ (ئەپۆلۆن)ی خوداوەند وەقف كردووە.[5]

## رۆمانییەكان

لەسەردەمی رۆمانییەكاندا دوو جۆر موڵك و كەل و پەل لەدەرەوەی بازنەی مامەڵەكردنەوە بوون، هەندێك پەیوەست بوون بەمافی خواوەو ئەوانی تریش بەمافی گشتییەوە، ئەو شتانەی كە پەیوەست بوون بە مافەكانی خواوە ئەمانەبوون:

١. شتە پیرۆزەكان: ئەو شتانە دەگرێتەوە كە پەیوەستن بەپەرستنی خوای گەورەوە، وەك ئەو زەوی‌و پەرستگایانەی لەسەریەتی، هەروەها ئەوەی لەپەرستگاكاندا هەن بۆ پەرستن، پیرۆزبوونیش بەرێوشوێنی تایبەتی خۆی دەبێت. لەسەردەمی رۆمانی مەسیحیەتیشدا شتەپیرۆزەكان بۆ پەرستن و كەنیسە بوون.

٢. شتە ئایینیەكان: بۆ بتی ماڵان و رۆحی باوو باپیران بەگۆڕستانەكانیشەوە تەرخان بوو.

٣. شتە پارێزراوەكان: ئەو شتانەبوون كە خرابوونە ژێر پاراستنی خواوە لەرێی ئاهەنگێكی تایبەتییەوە وەك دەرگای شارەكان و شوراو سنووری كێڵگەكان، لەسێدارەدانیش سزای ئەو كەسە بوو كە حورمەتەكەی پێشێل بكردایە[6].

لێرەوە ئەو كەل و پەلانەی پەیوەست بوون بەمافەكانی خواوە زۆر شتی گرتۆتەوە، چی بەر لەهاتنی ئایینی مەسیحیەت و، دوای ئەوەش، لە نووسراوەكەی (جۆستینان)[7]دا هاتووە: (شتە پیرۆزەكان، شتە ئایینییەكان و شتە حەرامەكان نابێتە موڵكی كەس، ئەوەی بۆ خوابێت نا بێتە موڵكی كەس). هەروەها رۆمانەكان وای دەبینن كە شوێنە پیرۆزەكان ئەگەر باڵەخانەكانیشیان تێكدران ئەوە زەوییەكانیان هەر بەپیرۆزی دەمێننەوە[8].

ئازادی مرۆڤیش بەوەی سیفەتی پیرۆزی بدات بەزەوییەكەی رەهانییە، بەڵكو دەبێت رێ وشوێن و پەرستشی تایبەتی لەلایەن كاهینەكانەوە بۆ ئەنجام بدرێت.

لەدوای هاتنی ئیسلامیش وەقف لای نەتەوەو ئایینەكانی تریش هەر بەردەوام بوو، بۆ نموونە جێرمانییەكان وەقفی (ذري)یان ناسیووە تیایدا




خاوەن موڵك موڵكەكانی تەرخان دەكات بۆ خێزانێكی دیاری كراو ماوەیەكی دیاری كراودا یان تا تۆویان دەبڕێتەوە، ئەسڵیش تیایدا ئەوەیە كە نافرۆشرێت و نابەخشرێت و رەقەبەكەش بەمیرات ناگیرێت.

لەسەرتاسەری ئەورووپای مەسیحیەتیشدا، وەقفەكان تەرخان دەكران لەسەر پەناگەو قوتابخانەو نەخۆشخانەو دێرەكان تا لەسەدەی جەڤدەهەم و لەرۆژانی حوكمی لویسی سیانزەهەمدا گەیشتە نزیكەی سێیەكی رووبەری فەرەنسا، بەڵام دوای شۆڕشی فەرەنسا ئەم وەقفانە بەموڵكی دەوڵەت دانران، دواتر ناچار بوون سیستمێك بۆ وەقفی خەیری دابنێن، كە جۆرە گونجانێك لەنێوان بیرۆكەی چاكەو بەرژەوەندی گشتیدا دروست دەكات.[9]

**هیچ نەتەوەو ئاینێك لەپێش ئیسلام و لەپاش ئیسلامیش، نەبووە وەقفیان بەشێوەیەك لەشێوەكان نەزانێ بێت**

## وەقفی ئیسلامی

ئەگەر وەقف لای كۆمەڵگەو بیروباوەڕەكانی تردا لەچوارچێوەیەكی تەسكدا بەڕێوە چووبێت، ئەوا لەكۆمەڵگەی موسڵماناندا شێوەیەكی فراوان و بەردەوام و دەزگایی وەرگرتووە، ئەمەش نامۆ نییە ئەگەر بێت و چاوێك بخشێنین بەو ئایەتانەی كە هانی مرۆڤ و موسڵمانان دەدات لەسەر چاكەكردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ/ سورة آل عمران/ ٩٢﴾و ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ/ سورة الذاريات-١٩﴾ و ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللَّهَ فَعَسَى أُولَئِكَ أَنْ يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ/ سورة التوبة-١٨﴾ و ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ* فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ* وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ* فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ* الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاَتِهِمْ سَاهُونَ* الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ* وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ/ سورة الماعون/١-٧﴾و ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى* وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى* فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى/ سورة الليل/٥-٧﴾و ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ/ سورة النحل/ ٩٧﴾و ﴿إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ/ سورة البقرة/٢٧١﴾.

ئەمە سەرەڕای ئەو فەرموودانەی كە پێغەمبەر(د.خ) لەم بارەیەوە ئاماژەی پێكردووە: **(من احتبس فرساً في سبيل الله ايماناً واحتساباً، فان شبعه وروثه وبوله في ميزانه يوم القيامة حسنات) (رواه البخاري وامام احمد).**

**(اذا مات ابن ادم انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له) (رواه الامام مسلم).**

وەقف لەبنەڕەتیدا لەدایك بووی ئەم بیرۆكە سادە پڕ مانایەیە (صدقة جارية)، واتە: چاكەكردنێك كە بەردەوام بێت، بەتێپەڕبوونی كاتیش، لەرووی تیۆریو پراكتیكەوە شێوە سیستمییەكی بەخۆوە گرت، لەگرنگترین تایبەتمەندیەكانیش ئەوەیە كە





پەیوەستە ژیانی دنیایی مرۆڤەکان و ژیانی دواییان، لەلایەکی تریشەوە پەیوەندییەکی هاوبەشە لە نێوان کۆمەڵگە و دەوڵەتدا.

لەبەرئەوەی لەقورئاندا بەراشکاوی ناوی وەقف نەهاتووە، بۆیە تارادەیەك رای جیاواز هەیە لەنێوان ئیمامەکاندا، هەروەها سەبارەت بەچۆنیەتی دروست بوونی یەکەمین وەقف رای جیاواز هەیە بەوەی ئایا پێغەمبەر(د.خ) یەکەمجار وەقفی کردووە یان حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێت) (ئەوەش بەلای ئێمەوە لەم باسەدا گرنگ نییە):

* پێغەمبەر(د.خ) (نقیع)ی وەقف کرد بۆ ئەسپی موسڵمانان.. وە (ربذة)شی[10] وەقف کرد بۆ ئەو وشترانەی کە بۆ خێر تەرخان کرا بوون.

* حەزرەتی عومەر(رەزای خوای لێ بێت) هاتە لای پێغەمبەر(د.خ)و پێی وت: (ئەی پێغەمبەری خودا، سامانێکم هەیە لەلای خۆم بەنرخەو دەمەوێت بیکەمە خێر)، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: (ئەسڵەکەی بکە بەخێر، نافرۆشرێت و نابەخشرێت و بەمیراتیش ناگیرێت بەلام داهاتەکەی دەکرێت بە خێر) حەزرەتی عومەر دوای ئەوە چەند ساڵێك مایەوە تا بوو بەخەلیفەو دواتر لەسەردەمی خەلافەتەکەیدا دۆکیومێنتی وەقفەکەی نووسی - کە بەکۆنترین حوجەی وەقفی دادەندرێت لەمێژووی ئیسلامدا- تیایدا هاتووە (ئەمە عومەری بەندەی خوا نووسی لە (ثمغ)، کە ئەسڵەکەی نافرۆشرێت و نابەخشرێت و بەمیرات ناگیرێت. بۆ هەژارو خزم و کۆیلەو رێی خوداو رێبوارانە، ئەوەشی سەرپەرشتی دەکات، گوناهی ناگات ئەگەر بەچاکە لێی بخوات یان یارمەتی هاورێیەکی پێبدات با لەناو ئەو کۆمەڵە کەسانەشدا نەبێت).

هەروەها هاوەڵانیش بەئاگاداری و ئیقراری پێغەمبەر(د.خ) وەقفیان کردووە هەروەك (ئەبوتەڵحە) کاتێك پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: (بابۆ خزمانت بێت، بۆ حەسانی کوری سابت و ئیبن ئەبی کەعب). هەروەها زوبێریش(رەزای خوای لێ بێت) هەمان شتی کردووە کاتێك خانووەکانی کردە وەقف و وتی: (وللمردودة من نباته غیر مضرة ولامضر بها). هەروەها هەریەکە لە ئەبوبەکر، عوسمان، عەلی، عائیشە، سەعدی کوری مەعاز، سەفیەی کچی حویەی (رەزای خوایان لێ بێت) وەقفیان کردووە، جابری کوری عەبدوڵلای ئەنساری وتویەتی "هیچکام لەیارانی پێغەمبەر(د.خ) نەبووە ئەگەر توانای هەبووبێت و وەقفی نەکردبێت"[11].

* لەدەوڵەتی ئەمەوییەکان و لەسەردەمی هیشامی کوری عەبدولمەلیك (٧١-١٢٥ك) یەکەم دیوانی بۆ وەقف دروستکرد بەشێوەیەك کە جیاکاربێت لەدیوانەکانی تری دەوڵەت، ئەویش کاتێك (ئەوبەی کوری ئەمری کوری حەومەلی حەزرەمی) فەرمانیدا وەقفەکان لەتۆمارێکی تایبەتیدا بنووسرێت تا مافی سوودمەندەکان پارێزراوبێت.

زۆرێ ئەو ئایەت و فەرموودانەی لەبوارێ چاکە کردندا ئاراستەی موسوڵمانان کراوە، دەروازەی لەوەقف کردۆتەوە

سەرەتا وەقفەکان لەلایەن واقفەکان یان ئەوانەی ئەوان دایان دەنان بەرێوەدەبران بەبێ هیچ چاودێرییەك و دەستتێوەردانێکی دەوڵەت، بەلام زۆر بوونی وەقفەکان و، گەشەکردنی ژیان لەکۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا وای بێویست

کرد چەند دەزگایەکی دیاریکراو دروست ببێت تا سەرپەرشتی بکەن، لەشارەکاندا دادوەرەکان بەخۆیان سەرپەرشتیان دەکردو موحاسەبەی متەوەلیەکانیان دەکرد، ئەگەر هەر کەمتەرخەمییەکیان ببینیایە لەپاراستنی موڵکەکەو چاککردنی، ئەوا سزایان دەدان، دادوەر لەم حاڵەتەدا وەك بریکاری خەڵك سەرپەرشتیان دەکرد.

هەر لەو کاتەوە وەقفەکان سەر بەدادوەرەکان بوون، واش باوبووە دادوەرەکان ئەسڵی وەقفەکە بپارێزن و، داهاتەکەی وەرگرن و، بەو شێوەیە خەرجی بکەن کە دیاری کراوە، ئەگەر سوودمەندێکی تێدابێت بەپێی مەرجەکانی وەقفکار ئەوە دادوەر رەچاوی دەکات.

* لەسەردەمی عەباسییەکانیشدا، دیوانی وەقف سەرپەرشتکارێکی بۆ داندرا کە پێی دەوترا (صدر الوقف) ئەم دیوانەش وەك دەزگایەکی ئەسڵی سەربەخۆ لەدیوانەکانی تری دەوڵەت مانەوە.

شایانی باسە لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکاندا، وەقفەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان پەلیان هاوێشت بۆ بوارەکانی قوتابخانەو مزگەوت و نەخۆشخانەو پەناگەو کتێبخانەو.. هتد، چیتر لەچوارچێوەیەکی دابڕ نەمایەوە تەسکدا، هەر بۆ نموونە لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا یەکەم نەخۆشخانە لەئیسلامدا دروست کرا کە تایبەت بوو بەنەخۆشی (گەڕی)، نەخۆشەکانیش خۆراکیان بۆ برایەوە، ئەم فراوانبوونەو هۆگری خەڵك پێوەی وای کرد چەند پێکهاتەیەك دروست ببێت تا بەڕێوەی ببات و چاودێری بکات.

* خەلیفەی فاتمیش (الحاکم بامر الله) لەساڵی ٤٠٠ك و ٤٠٥ك زۆرێك لەزەوی و زارو خانوو و حانوت و کۆگای لەسەر زانکۆی ئەزهەر وەقف کرد، خانەی زانست و بوژانەوەی زانست و مەزاهیبەکان قوتابیانی هەندێ لەهەرێمەکان.

* (سەلاحەدینی ئەیوبی) لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتیدا زۆر لەدەزگای خێری لەوڵاتی شام و میسردا دروست کردووە، وەك قوتابخانەو نەخۆشخانەو.. هتد، بەبێ ئەوەی ناوی خۆی لەسەر هیچیان تۆمار بکات، بەڵکو بەناوی سەرکردەو نزیك و هاوڕێبازەکانییەوە تۆماری دەکرد، ئەمەش ئەوپەڕی چاکەو خۆدارنینە لەتێکەڵ کردنی هەر ئارەزوویەك، یەکێك لەدەزگا وەقفیە بەناوبانگەکانی سەلاحەدین (رەزای خوای لەسەربێت) ئەو دوو سولاوکەیەی کە لەسەر یەکێك لەدەرگاکانی قەڵای دیمەشقی دانا -کە تائێستاش ماوەتەوە- سولاوکەیەك کە شیری لێ دەچۆڕا لەگەڵ سولاوکەیەکی ترکە ئاوی لێ دەچۆڕاو شەکری تێدا توابووەوە بۆ ئەو دایکانەی کە لەهەفتەیەکدا دووجار دەهاتن تا ئەوەی پێویستیان بوایە بۆ منداڵەکانیان ببردایە[١٢].

* لەسەردەمی مەمالیك و لەبەرامبەر توندبوونی مەترسییە دەرەکییەکان (خاچپەرست و تەتەرەکان) زەوییەکەی گۆڕان بۆ (زەوییەکی جەنگی) کە دەوڵەت دەستی بەسەرداگرت لەپێناو بەرگری کردن لەدژی داگیرکەران.

* کاتێکیش عوسمانییەکان جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست، چوارچێوەکەی فراوانتر بوو ئەویش لەبەرئەوەی سوڵتانەکان و کاربەدەستەکان گرنگیان

**سەلاحەدینی ئەیوبی دەزگایەکی زۆری وەقف لەوڵاتی شام و میسردا دامەزراند بەڵام بەبێ ئەوەی ناوی خۆی لەسەر هیچیان تۆمار بکات**




پێدەدا، بۆیە چەند پێکهاتەیەکی بەڕێوەبردنی بۆ سازدرا تاگرنگی بەچاودێری کردنەکەی بدات، چەند یاساو سیستمێکیش دەرچوو بۆ ڕێکخستنی کارەکانی، تا ئەمڕۆشمان زۆر لەو یاساو سیستمانە کاریان پێدەکرێت.

* لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتە نوێیەکان لەناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە، وەقف بەشێوەیەکی گشتی لەجیهانی ئیسلامیدا پاشەکشەی کرد، ئەویش لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتانەی تۆتالتیاری بوون و، نەیاندەویست هیچ جۆرە دەزگایەکی سەربەخۆ لەپاڵ دەسەڵاتی دەوڵەتدا هەبێت.

لێرەوە وەقف ڕۆڵێکی گەورەو شارستانی گێڕاوە لەژیانی موسڵماناندا لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا، بەشێوەیەك هەردەم وەك ئەڵقەیەکی گەیاندنی وابووە لەنێوان کۆمەڵگەو دەوڵەتدا، هاوکات بەزۆر هەورازو نشێودا تێپەڕیوەو، هەندێ جاریش دەسەڵاتداران کاریگەریان لەسەری هەبووە چ بەئیجابی یان سەلبی، ئێمەش لەکوردستاندا خوازیارین وەقف ببێتە دەزگایەکی کارامەو، ببێتە ئەو چاوچێوەیەی کە خەڵکی کارە چاکەخوازییەکانی خۆیانی تێدا ببیننەوە.

## پەراوێزەکان:

١. عقائد الإسلام.. وجود الله، د.يوسف القرضاوي، ص٢٣.
٢. هەمان سەرچاوە، ل٢٣.
٣. احكام الوقف في الشريعة الاسلامية، د.محمد عبيد عبدالله الكبيسي، ج١، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٧، ص٢٤.
٤. الوقف، تصنيفه، والقوانين الخاصة به، كامل السامرائي، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٨، ص٣.
٥. هەمان سەرچاوە.
٦. تاريخ القانون، د.آدم وهيب النداوي ود.هاشم الحافظ، ١٩٨٩، ص١٥٧-١٥٨.
٧. احكام الوقف.. هەمان سەرچاوە، ل٢٥.
٨. هەمان سەرچاوە.
٩. الوقف، تصنيفه، هەمان سەرچاوە، ل٣.
١٠. دوو گوندن لەنزیك مەدینە.
١١. دور الوقف في الحضارة الاسلامية، ابتهال محمد علي، مجلة المجتمع، العدد ١٢٧٦، ١٩٩٧، ص٢٦.
١٢. هەمان سەرچاوە، ل٢٦و ٢٧.

## سەرچاوەکان:


١. احكام الوقف في الشريعة الاسلامية، د.محمد عبيد عبدالله الكبيسي، ج١، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٧.
٢. الوقف، تصنيفه، والقوانين الخاصة به، كامل السامرائي، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٦٨.
٣. دور الوقف في الحضارة الاسلامية، ابتهال محمد علي، مجلة المجتمع، العدد ١٢٧٦، ١٩٩٧.
٤. الاوقاف والسياسة في مصر، د.ابراهيم البيومي غانم، دار الشروق، الطبيعة الاولى، ١٩٩٨.
٥. تاريخ القانون، د.ادم وهيب الندوي ود.هاشم الحافظ، ١٩٨٩.
٦. هل الاسلام هو الحل... كيف ولماذا؟، د.محمد عمارة، دار الشروق، الطبعة الثانية ١٩٩٨.





مامۆستا مەلا عەبدولقادر سکتانی

# مامۆستایەکی ئایینی، چاکسازیخوازی کۆمەڵگا

گفتوگۆ: جەعفەر گوانی



وێنەی مامۆستا لەساڵی ١٩٦٥

مامۆستا مەلا عبدولقادر سکتانی- گەلاڵی ناوێکی دیارو بەرچاوە لەنێو مامۆستایانی ئایینیو، ناوێکی دیارە لەبواری خزمەتکردن بەئایینی پیرۆزی ئیسلام لەرێی گوتنەوەی وانەکانی خوێندنی ئیسلامی بەبەردەوامی تاکو ئێستاکەش هەر بەردەوامە. هەروەها مامۆستا لەرووی چاکسازی کۆمەڵگاو چارەسەر کردنی گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای کوردەواری بەتایبەتی ئەو کاتەی مامۆستا لەگەلاڵەو دەڤەری بالەکایەتی بووە، چونکە لەوێ زیاتر ئەو مەیدانەی بۆ فەراهەم بووە. جیا لەوانەش مامۆستا چاکسازیخوازو مامۆستای ئیسلامی بووە هەروا پێشڕەوو هەڵگری ئالای هەستی نەتەوەییو قوتابخانەی کوردایەتییە، بە کورتی دەتوانین بڵێین: مامۆستا پەرتووك و کتێبێکی مەزنە لەبوارە جودا جوداکان، لاپەڕەکانی پڕن لەوانەی مەزن و سوودبەخش و پرۆگرامی ژیان، کە بەشێوەی پراکتیك لەژیانی رۆژانەی مامۆستا رەنگی داوەتەوە، مرۆڤ دەکرێت زۆر بەباشی بیانکاتە سەرمەشقی ژیان. کاتێك لاپەڕەکان هەڵدەدیتەوە یادگاری خۆش و، هەروەها تاڵ و سوێری زۆریشی تێدایە. لێرەدا وەك وەفادارییەك بۆ ئەو خزمەتە پان و پۆڕەو، هێشتنەوەی ئەم ژیانەو بە پێویستمان زانی رووبەڕوو لەگەڵ مامۆستا دابنیشین و بیدوێنین. هەرچەندە مامۆستا خۆی لەقەرەی هەموو ئەو باسانە نەدەدا کە دەما نخستە بەردەمی، بەلام هەندێکمان هەر لێ وەرگرت. حالی حازر مامۆستا چاوەکانی کەم بین بوونەو بەئاسایی نابینێت، لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا لەکاروانی خزمەتکردن بەردەوامە، هەموو رۆژێك لەمزگەوتی ( شێخ الله ) پێش نوێژی دەکات، هەروا رۆژانەش لەحوجرەی ئەهلی لەسەر قەلاتی زێڕین وانە دەڵێتەوە، یەکێتی زانایان ئەم قوتابخانە ئایینییەی بۆ داناوە. هەروا مامۆستا ئەندامی لیژنەی بالای فتوای سەر بەیەکێتی زانایان و ئەندامی ئە نجومەنی زانستی سەر بەوەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامییە. زۆر بەسانایی ناتوانین لەمامۆستا تێبگەین چ مرۆڤێکی مەزنە.. . ئەوەی خوارەوە پوختەی دیمانەکەیە:





**لەساڵی ١٩٦١ لەسەر داوای جەنابی بارزانی بوومە ئیمامی گەلاڵەو قازی شەرعیش**

*** ماموستا ئەگەر کورتەیەك لەسەر گوزەشتەی ژیانت باس بکەیت؟**

- من ناوم مەلا قادر شێخ محەممەد سکتانییە، لەساڵی (١٩٢٧) لەگوندی (سکتان) لەدایك بوومە. یەکەمجار لەلای باوکم دەستم بەقورئان خوێندن کرد، چونکە باوکم خوێندەواری هەبوو. تا کتێبی (مەلا جامی) خوێندبووی پاشان لەتەمەنی (١٢) ساڵی لەلای مەلا ئەحمەدی کورە پورم دەستم بەکتێبە سەرەتاییەکان (ئەحمەدی‌و عوامل الجرجانی)م خوێندن، ئینجا چوومە لای مەلا عەبدولرەحمان شەقلاوەیی کە موستەعیدی ماموستا مەلا عەبدوڵڵای سکتان بوو خۆی لەمادەکانی سەرو بوو، کتێبی (گلنبوی برهان)ی دەخوێند، منیش لەکتێبی (الانموذج) تاکو گەیشتمە (جامی) لەلای ئەوم خوێند ئەوەی راستی بێت زۆر بەدین و بەتەقوا هەروا زۆریش زیرەك بوو، بە(سرێشمەیی) ناسرابوو. پاشان هەندێکم لە (مختصر المعانی) لەلای ماموستا مەلا سادق لەشەقلاوە خوێند. دواتر چوومە لای ماموستا مەلا عەلی مامەجەلکەیی، تەواوی (مطول)م لەلا خوێند، ئەویشیان هەروا زۆر زیرەك و لێهاتوو بوو. با ئەوەش بڵێم (شرح العقائد)م لەلای ماموستا شێخ عومەر بالیسانی خوێند کە ئینسانێکی زۆر زانا بوو. پاش ئەوە چوومە رەواندوزو زۆربەی زانستەکانم لەلای ماموستا مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی لەرەواندوز خوێندن. بەلام لەبەر ئەوەی ماموستا ئەفەندی زۆر دەرسی دەچواندم لەوێ رۆیشم چوومە گوندی روستێ لەوێ لەلای ماموستا مەلا ئەحمەدی روستایی (مەلای گەورە) دەرسم خوێند، ئەم ماموستا بەرێزە زۆر زاناو خواپەرست بوو. دووبارە ماموستا مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی لەرواندزێ خەبەری پێدام کە بچم بۆ لای ئەو. دوای ئەمە ویستی دەڤەری شارەزوورو شاری سلێمانیم کرد. ئەوە بوو چوومە بیارە لەوێ لەلای ماموستا مەلا عەبدولکەریم مودەرس تاکو (قازی لاری)شم خوێند، پاشان جارێکی دیکە گەرامەوە رەواندوز کتێبەکانی (رسالة الحساب)و (تشريح الافلاك)م لەلای ماموستا مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی خوێندن.

پاشان شێخ عەلائەددین خەبەری بۆ ناردم کە بۆ وەرگرتنی ئیجازە بچمەوە بیارەو لەوێ وەری بگرم. ئەوەی راستی بێت من خۆم دەمەویست لەلای ماموستا عبدولکەریم ئەفەندی





ڕەواندوزی وەریی بگرم، بەڵام وەك گوتم جەنابی شێخ بەمیری دەرگەڵەی خەبەری نارد بوو بۆ ئیجازە وەرگرتن بێتەوە بیارەو پاشان بێتە مەلای دەرگەڵە، ئینجا جەنابی شێخ سادقی ماویلیان هاتە ڕەواندوزێ لەدوای ناردم و پێی گوتم: جەنابی ئەمری کردووە لەگەڵت بێم تا ببیتە مەلای دەرگەڵەی، منیش بڕیارمدا ئەمری شێخ تەنفیز بکەم. ئینجا لەسەر قسەی ئەو بڕیارمدا بچم لەگەڵ دوو لەفەقێیانی خۆم یەکێکیان شێخ محەمەدی کوڕی شێخ مەلا سادق بوو کە جامی دەخوێند لەگەڵ مەلا عەزیزی پاشکۆزی کە سەید عەبدوڵلای دەخوێند، هەرسێکمان بەیەکەوە چووینە گوندی ماویلیان و، سێ شەوو سێ ڕۆژ لەماویلیان لەلای شێخ مەلا سادق ماینەوە، ئەو سێ ڕۆژە شێخ بەردەوام کتێبەکانی پێدەخوێندمەوە بۆ ئەوەی بزانێ ئاستی زانستیم چەندە (ئایا شیاوی ئەوەین لەگوندێك ببینە پێشەواو مەلای خەڵکەکە یان نا؟) ڕۆژی سێیەم مێزەرێکی لەسەری من ناو گوتی بابچینە دەرگەڵەی، چونکە هەروا لەخۆوە نییە شێخ تۆی ناردووە، کە چووینە ماویلیان بەهۆی هاتنی شێخ مەلا سادق بۆ ماوەیەکی کەم میرو تەواوی خەڵکی گوندەکە کۆبوونەوە. هەمان کات کرامە مەلای دەرگەڵە، ئەوە پێش وەرگرتنی ئیجازە. دوای ماوەیەك دووبارە لەبیارە لەدوایان ناردمەوە لەبەهاردا چوومە بیارە، دوای ماوەیەك لەلای مامۆستا مەلا



مامۆستا سکاڵای کەمیکی مەزنە، لەبوارە جودا جوداکان لایەرەکانی بڕن لەوانەی مەزن و سوود بەخشن

عەبدوڵکەریمی مودەڕس لەساڵی (١٣٧٩ کۆچی) ئیجازەم پێبەخشرا. دوای ئەوە لەگەڵ کۆمەڵە فەقێیەك هاتمەوە دەرگەڵە. هەر لەو گوند ژنیان دامێو بوومە مەلای یەکجارەکی گوندی دەرگەڵە. ئێستاش دوو منداڵم خوارزای دەرگەڵەیییان. یەکێیان وا لەدەرگەڵەو ئەوی دیکەیان ناوی عەبدوڵلایە لەئێرانە. ئینجا چومە گوندی (ناوەندە) لەدەڤەری باڵەکایەتی، ماوەی ١٣-١٤ ساڵ لەوێ مامەوە، خەڵکێکی زۆر باش بوون.

*** مامۆستا ئیجازە وەرگرتنی ئەو کاتی هیچ مەرجێکی بۆ هەبوو؟**

– ئەو کاتی مەرجی ئیجازە ئەوەبوو کە تەواوی کتێبەکانی خوێندبێت کە بە (رسالة الحساب)و (تشریح الافلاك) کۆتایی پێدێت. شتێکی وا نەبوو کابرا کتێبێك بخوێنێت نەشزانێت بیلێتەوە. ئەم جۆرە شتانە دوایی سەریان هەڵدا. ئێستاکە نە مەلا ئامادەیی ئیجازەدانی هەیە نە فەقێش ئیجازە وەرگرتن.

*** ئەی خۆت هیچ ئیجازەت بەهیچ فەقێیەك داوە؟**

– لەدەرگەڵە زیاتر لە (١١) فەقێم هەبوون (٧) ئیجازەشم داون یەك لەوانە (شێخ محەممەدی خۆشکان) ئەوەی شێخ مەلا کەریمیو (مەلا شێخ سەعید) هەروەها (مەلا سەید ئەحمەد سەروچاوەیی) هەروا (مەلا عوسمانی کەرکوکی) بەڵام ئەو کەسەی ئیجازەم پێ دەدا دەبێت شیاو بوایە، ئەگینا نەخۆم دەکەمە جێی گاڵتە پێکردن و نەفەقێیەکانیش. باشە ئەگەر شیاو نەبێت چی لێبکەم. لەم ساڵانەی دوایش ئیجازەم داوەتە مەلا یاسین لە مزگەوتی عومەری کوڕی خەتاب لەهەولێر لەو مەدرەسەیەی سەر بەیەکێتی زانایانە.





*** مامۆستا باسی شێخ مەلا سادقی ماویلیانت کرد، ئێمە زیاتر وەك زاهیدێك ناسیومانە، بەلام ئایا لەرووی عیلمەوە هیچ توانایەکی هەبووە؟**

- بەڵێ شێخ مەلا سادق زۆر لێهاتوو و، توانای زانستی زۆر بەرز بوو لەکێتبەکانیش زۆر وردبوو. من شایەتی ئەوە دەدەم دەیتوانی تادەگاتە (مطول)یش بڵێتەوە. ئەوەش زۆر بەچاکی.

*** بۆچی خەڵکی ئەوکاتی زیاتر خزمەتی فەقێیانیان دەکرد، ئەی بۆچی فەقێیانی ئەو کات بەشێوەیەکی گشتی زیرەکتربوون؟**

- میللەتی ئەوکات موسڵمانتر بوو لەهی ئێستا، فەقێیانیش بۆ خوێندن دڵسۆزتر بوون. هەروا مەلاکانیش دەرسیان زیاتر بۆ خوا دەگوتەوە. کەچی ئێستا گۆڕاوە هەموو مەبەستەکان بوونەتە شەهادە وەرگرتن و پلەو پایە نەك زانست و مەلایەتییەکی باش.

*** مامۆستا هۆی چییە ئێستا کەمتر خەڵك سینگی بۆ ئەو زانستە پیرۆزە دەکاتەوە؟**

- ئێستا مەسەلەکان زیاتر بوونەتە تەماحی دونیایی. ئەوانەشن بوونەتە مایەی ئەوەی کە خەڵك سینگی خۆی بۆ ئەم زانستە نەکردۆتەوە. فەقێی وا هەیە لەئاستێکی بەرزدایە، بەلام لەبەر شتی دونیایی خوێندنەکەی فڕێ دەدات. زروفیش دەوری خۆی هەیە، چونکە کە دەبینێت بەو عیلمە بژێوی ژیانی بۆ دابین نابێت یەکسەر پەنا دەباتە بەر کاسبی کردن.

## بارزانی بەخۆی پێشنیازی دامەزراندنی یەکێتی زانایانی ئیسلامی کوردستانی کردو منیش یەکێك بووم لەدەستەی دامەزرێنەری

*** ئەگەر بێینەوە سەر باسی ژیانەکەت لەو کاتەی لەگوندی (ناوەندە) بوویت؟**

- لەو کاتەی من لەناوەوەندە بووم جەنابی مەلا مستەفا هاتە ئەوێ لەو کاتەی کە هات پیاوێکی بەدوامدا ناردو گوتی: سەیدا جەنابی مەلا مستەفا ئەمردەکات بێیت. منیش چوومە خزمەتیو چاك و باشیمان لەیەکتر کرد. زۆر پرسیاری ئاینیی لێم کرد، کە لێرە دەرفەتی باسکردنیان نییە، چونکە مەلا مستەفا بارزانی زۆر زانا بوو لە زۆر لەمەلاکانی ئێستاش باشتر بوو، ئینجا دوو پرسیاری لێکردم، منیش وەلامم دایەوە گوتی: (خودێ تو قەناعەتا من هینا. لەم دوو سوئالەی لەگەل زاوێتەی من هاتووم کەس قەناعەتی نەهێناوم تۆ نەبێت) لەناوچەی باڵەکایەتی سوڕایەوەو گوتی: (دوو پرسیارم هەبوو کەس قەناعەتی منی نەهێنا مەلا ناوەندی نەبێت).

*** چۆن لەدوای تۆی نارد؟**

- ئەوەبوو هاتە گوندی ناوەند، بۆ هەر شوێنێك دەچوو بەدوای مەلایەکەی دەنارد- ئینجا هاتە ماڵی مەلا برایم ئاغای. دوای ئەوەی کە دوو پرسیارەکەی لێکردم گوتی: (وەرە گەلاڵەی) منیش لەسەر قسەی ئەو هاتمە گەلاڵەی. جارێکی دیکە لەناوپردانێ لەماڵی حەمەدئەمین ئاغای ناوپردانی لەگەڵ مەلا ئەحمەدی خوشکان بووم لەوێ چووینە لای مەلا مستەفای بارزانی. پێی فەرموویین عیشایێ




وەرنــە لام لەگەڵاڵــە (نــەشمان حزانی بۆ چییەتی؟ کە چووینە ی خەڵکی گەلاڵێی کۆکردەوەو گووتی: من دەمەوێت فلان کەس مەلا عەبدولقادر بێنمە گەلاڵەو بیکەم بەقازی شەرعی. ئایا ئێــوەش پێتــان خۆشــە ئیمامەتیتان بۆ بکات یان نا؟ ئەگەر پێتان خۆشە با ئیمامیش بێت. ئەگینا ئیمامێك بۆ خۆتان دەست نیشان بکەن. ئەوانیش گوتیان: قوربان ئێمە زۆرمان پێخۆشە هەر نیازمان وابوو لەدوای بنێرین مادام وا رێکەوت ئەوە باشتریش، ئەو رووداوەش لەساڵی ۱۹٦۱ بوو.

*** ئەو قازیەتیەی درا بەجەنابت چۆن بوو؟**

– من قازی شەرعی تێکرایی شۆڕش بووم نەك تەنها هی ناوچەیەك. لە هەر ناوچەیەکیش قازیەکی تایبەتی دانـدرا. بۆ نموونە مەلا ئەحمەدی سکتان لەرانیە دانرا. بەڵام شەرعی سەرەکی لەگەلاڵە بوو. چونکە ئەو کاتی بەهۆی جێنشینی مەلا مستەفا بارزانی گەلاڵــە وەك پایتــەخت وابــوو. بۆ هــەر شوێنێکیش چووبوایە قازییەکی بۆ دادەنا (بۆ چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان) هەروەها مەلا ئەحمەدی بێلینگــەی بۆ ناوچەی بێلینگە دانا. بەڵام بۆ فتوای سەرەکی ئێمە لیژنەیەك

بووین کە لەچوار کەس پێکهاتبووین. ۱. من خۆم سەرۆك بووم ۲. مەلا وەیسی گرتکی- ئەندام ۳. مەلا عوسمان رۆستایی- ئەندام ٤. مەلا مستەفا داروسەلامی- ئەندام.

*** ئەو جارە بابێینە سەر باسی یەکێتی زانایان؟**

– من یەکێك بووم لەوانەی لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستاندا بووم. بارزانی بەخۆی پێشنیازی دامەزرانی یەکێتی زانایانی کرد. زوو زوو مەلای ناوچەکانی سلێمانیو هەولێر دەهاتنە سەردانی بارزانی. جارێکیان وا رێکەوت چووینە لای گوتی: (پێم خۆشە تاکو ماوم حکوم بەقورئان و شەریعەت، بکرێت چونکە ئەو قانونە فەرەنسییە) بۆ ئوممەتی ئیسلامی دەست نادات ئێوە لەنێوان خۆتان ئیتیحادێك دابمەزرێنن منیش پشتگیری ئێوە دەکەم. لەسەر ئەو بڕیارە گوتیان زۆر باشە. ئینجا بارزانی لیژنەی ئامادەکاری‌دا بۆ ئەوەی تەواوی مەلاکان ئاگادار بکەنەوە. یەك لەلیژنەکان پێکهاتبوو لە ۱. من ۲. مەلا عوسمانی گۆجە ۳. مەلا سەعید مەلا وەیسی. ئێمە بۆ ناوچەکانی سلێمانی- کەرکوك. بۆ هەموو ناوچەکانی دیکەشی دانان. ئینجا ئێمە

چووینە ناوچەکانی سلێمانی- کەرکوك- هەڵەبجەمان ئاگادار کردنەوە هەموو مەلاکانمان تێگەیاندن لەرۆژی دیاری کراودا لەگەلاڵە ئامادەبن. پاشان هەر ئێمە چووینە لای زاخۆش. مەلاکانی کوردستان زۆر بەخۆشحالییەوە بەپیر ئەمری بارزانییەوە هاتن. تەنها مەگەر یەکێك لەشوێنێکی ترسناك بووایە. لەرێکەوتی ۱۹۷۰/۹/۲۱ نزیکەی (۵۰۰) مەلا لەمزگەوتی گەلاڵە کۆبوونەوە، کە لە هەموو لایەکەوە هاتبوون. ئینجا من وتاری بەخێرهاتنم خوێندەوە. ئینجا بارزانی هات وتارێکی کورتی خوێندەوە، کە تیایدا پشتگیری تەواوی مەلاکانی کرد. دوای لیژنەکان کۆنگرە داندران من و مەلا عوسمانی هەڵەبجەییو خەتیبی سلێمانی لیژنەی داڕشتنەوەی پەیڕەوو پرۆگرام بووین. ئینجا دوای هەڵبژاردنێکی ئازاد مەلا عەلی هەولێری کرا بەسەرۆکی یەکێتی زانایان، شیاوی ئەوەش بوو پیاوێکی لێوەشاوە بوو. دوای ئەوە دەستەی مەکتەبی تەنفیزی دامەزرا کە لە ۱. من ۲. مەلا وەیسی گرتکی ۳. مەلا عوسمان رۆستایی ٤. مەلا موستەفا داروسەلامی پێکهاتبوو. هەروەها بۆ هەر ناوچەیەکیش یەکێك دیاریدەکرا. ئەو کاتی




یەکێتی زانایان وەك ئێستا نەبوو کە دەستەی کارگێڕی لە (٢١) ئەندام پێکهاتبوو.

*** ئەی دەربارەی دادگای شەرعی چۆمان؟**

– مەلا عەلی سەرۆکی ئیتیحاد خۆی لەوێ بوو. هەروەها مەلا مستەفا داروسەلامی دەورێکی زۆری هەبوو.

*** ئەی دوای تێکچوونی شۆڕش؟**

– کە شۆڕش تێکچوو لەمانگی پێنجی ساڵی ١٩٧٥ مەلایەکانیش لەگەڵ شۆڕش لێکدابڕان و بڵاوەیان کرد.

*** ئەی لە بارەی فەقێیانەوە؟**

– ئەو کاتی ئەوانەی بەشداری یەکێتی زانایانیان دەکرد هەر مەلا بوون. فەقێی تێدا نەبوون. بەڵکو فەقێیان هەر دەیانخوێند.

*** ئەی لەبارەی خوێندنەوە هیچ رۆڵێکتان هەبوو؟**

– کە بەڕێوەبەری ئەوقاف لەدوای پەیماننامەی (١١)ی ئازار هاتە ئێرە من لەگەڵی لەگەڵاڵە و دووەم لەقەلادزێ و سێیەم لەهەڵەبجە. پەیمانگاکەش رەسمی بوو (٦٠) قوتابیمان هەبوو ئەو کاتی مەلا عەبدوڵلای مزگەوتی سپی لەگەڵا لەگەڵماندا بوو.

*** ئەی مەسەلەی خۆ تەقاندنەوەی بەناو مەلاکان لەحاجی ئۆمەران؟**

– کاتێ هەواڵی خۆ تەقاندنەوە هات ئێمە لەگەڵاڵە بووین، هەمان کات هەر چوارمان چووینە حاجی ئۆمەران. ئەوکاتی خەڵکێکی زۆر دەهاتە سەردانی ئەو، ئێمەش لەژوورێك دانیشتین چاوەڕوانی ئەومان دەکرد، پاشان چووینە ئەو ژوورەی کە ئەوی تێدابوو، موعجزەیەکی سەیرمان بینی. مێزێك داندرابوو کە قورئانێکی لەسەر بوو. ئەو هەموو تاق و دیوارانە هەمووی خوێن و پارچە گۆشت بوون، کەچی ئەو مێزەیە تەنها دلۆپە خوێنێك یان پشکە




چوومە لای مەلا مستەفا، مەلا مستەفا پێی گوت: دەچیتەوە سێ معهەد دەکەیتەوە. یەکیان خوێنێك یان گۆشتێکی پێنەکەوتبوو. (١١) مەلا بوون بەڵام راستیەك هەیە هەموو ئەوان بەو نیازە پیسە نەهاتبوون بۆ نمونە عەبدوڵجەبار ئەعزەمی زۆر دەهاتە لای بارزانی مرۆڤێکی زۆر دڵسۆز بوو. لەڕێی ئەوەوە هاتبوون، کەچی خۆی نەیزانی بوو بۆ شتێکی وایە. برایەکی خۆشی لەگەڵدا بوو ئەوەی زۆر جێی سەرسوڕمانە لەگەڵ ئەو کارەساتەش تێڕوانینی مەلا مستەفا بەمەلایان هەر وەك خۆی بوو هیچ نەگۆڕا. چونکە دەیزانی ئەوانە بەعسین مەلا نین. کە هاتە لای ئێمە بەدەنگێکی بەرز گوتی: (السلام علیکم) ئینجا گفتوگۆیەکی زۆرمان کرد بەبێ ئەوەی هیچ شێوابێت. نمونەی ئەو لەنێو سەرکردەکانی ئەمڕۆدا نییە.

*** ئەی سەرو بەندت لەگەڵ کتێب دانان؟**

– لەبەر کاری تەدریس کەمتر خەریکی نووسین بوومە تەنها حاشیەم لەسەر تەفسیری (المدارك) هەیە، ئەویش چاوم نابینێت بینووسمەوە. کەسیش نییە بۆم بخوێنێتەوە و بینووسێتەوە.

*** دواشت بتەوێ بیڵێی؟**

– دەمەوێ باسی کاتێکی ناخۆش خۆم بکەم، کە ناخۆشترین کاتم بووە ئەوەبوو کە لەساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی کورد تێکچوو بۆ ماوەی پێنج ساڵ بۆ باشووری عێراق مەنفی کرام.




ئەوەش بەدەست نیشان کردن وایان لێکردم، چونکە دەیانگوت: (قازی شۆڕش) بووە. لەگەڵاڵە منیان گواستەوە بۆ مشروع مسیب) کە سەر بە(حلە)یە، چوار ساڵ لەوێ بووم. سالێکیش لەبەغدا منیان هێنا بۆ مزگەوتێك کە جێگای نووستنی نەبوو، دەبوایە شەوان بگەڕابام لەشوێنان بنوستبام. بۆ ماوەی سالێك لەو مزگەوتە مامەوە. بەراستی ئەو کاتانەشم خۆش بوو کە لەگەڵ مەلا مستەفادا بووم.

**ئێمەش دەڵێین:**

**زۆرن ئەو مامۆستا بەتەمەنە بەڕێزانەی کە لە پێناوی شۆڕشی کورد زۆر تاڵیو سوێریان چێشتووە. خۆزگە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئاورێکی تایبەتی لێدەدانەوە.**

---

# إذا دَعَتْكَ قُدْرَتُكَ على ظُلْم الناسْ فَتَذَكَّرْ قُدْرَةَ اللّه عَلَيْكَ

**الامام علي بن ابي طالب**

## ئەگەر هێز و توانات هانی دای بۆ ستەم کردن لە خەڵك ، بیر بکەرەوە لە توانای خوای گەورە لەسەرتا

**ئیمامی عەلی**



# تویژینەوە لەسەر فیقهی ئیسلامی

# هۆکارەکانی جیاوازی بۆ چوونی زانایان لە فیقهی ئیسلامیدا

ئەڵقەی/ دوازدەیەم

مەلا عەبدوللەتیف باموکی

## رەها و پەیوەندو کاریگەریان لەسەر جیاوازی

ئەم دوو زاراوەی ناو فیقهی ئیسلامی لەسەر جیاوازی بیروڕای زانایان لەحوکمە شەرعییەکاندا کاریگەری زۆریان بووە، چونکە دەخوازێ ئەم رەهایە لەسەر مەبەستی خۆی مابێتەوە یان پەیوەندکرابێت بەبەندێك، بۆ ئەم مەبەستەش روون کردنەوەی دەوێ. رەهاو پەیوەند بەرامبەری یەکدی دەبن و هەردووکیان بەشی تایبەتن. پێناسەی رەها دەکەین بە(هەر وشەیەك کە بۆ یەك یان چەند یەکەیەکی بڵاوو هیچ بەندێکی لەگەڵ نەبێت، کە لەرەهاییو بڵاوی کەم بکاتەوە، نموونەش وەك شایەت. وەلی، تاوان، سزا، رۆژ کە بەندی وەك وەصف، مەرج، شوێن، کات و هەندێ شتی تر، بەڵام پەیوەند ئەوەیە بۆ تاکێك یان چەند تاکێك کە بۆ هەموویان بشێ، بەڵام پەیوەند بەبەندێك کە بڵاویەکەی کەم بکاتەوە وەك شایەتی عەدل، وەلی شارەزا، تاوانی کوشتن، سزای تۆڵە، رۆژی یەك لەدوای یەك، رۆژان پێکەوەو شتی لەم بابەتە. ئەم پەیوەندە دەپۆلێت بەپێی زۆریو کەمی بەندەکانی..

## حوکمی رەها

وەك زاراوە هەر وشەیەك لەدەقێکدا بەرەهایی هاتبێت راست وایە کاری پێ بکرێت وەك خۆی ئەگەر بەڵگەی پەیوەندکردنی نەبوو، لەکاتی راڤە کردنی دەقدا مافی (مفسر ومجتهد)و دادوەرو قازی نییە لەرەهایی کەم بکاتەوە هەتا بەڵگەی پێ نەبێت. نموونەش وشەی (ایام) چەند رۆژێك بەرەهایی لەقورئاندا هاتووە: **﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ/ سورة البقرة-١٨٤﴾** وەك خۆی بەرەهایی حوکمی پێ دەکرێ، چونکە وەك وتمان رەها و پەیوەندی لەبەشەکانی تایبەتە (خاص) وئامارژەکانی (قطعی)و بێ چەندو چۆنە، کەواتە ئەگەر کابرایەك لەرەمەزاندا رۆژووی شکاند لەبەر نەخۆشی یان سەفەر یان هەربیانویەکی دیکە پێویست نییە هەموو رۆژەکان سەرەمرو لەپاش یەکتر قەزای بکاتەوە، بەڵکو دەتوانێ جیاجیاو بەسەریەکەوە قەرەبووی بکاتەوە یان وشەی (نساءکم) لەئایەتی **﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ / سورة النساء-٢٣﴾** واتە دایکی ژنەکانتان قەدەغە کراوە. ئەم وشەیە لەمارەبڕینەوە



دەگرێتەوە هەتا دوایی، تەنها بەگرێبەندی مارەبڕینەکە قەدەغە دەبێت. هەروەها وشەی (ازواج) لەئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا/ سورة البقرة-٢٣٤﴾ کە بەپێی ڕەهایی دەقەکە ژنی پیاو مردوو چوار مانگ و دە شەو عدەیەتی بەهەر شێوەیەك هەبێت تەنها گرێبەندی مارەیی کرابێ، بەڵام ئەگەر بەڵگە هەبێت ئەو کاتە ڕەها بەپێی بەندەکە کاری پێدەکرێ وەك (وصية) لەئایەتی: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا/ سورة النساء-١٢﴾ کە پێویستە وەسیەت لەسێیەك زیاتر نەبێ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) کە بەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی فەرموو: (سێیەك و سێیەك زۆرە) (سبل الاسلام/ ج٣/ ٣٧) کەواتە ئەم (وصية) نابێ لەسێیەك زیاتربێت، چونکە پێغەمبەر کە ڕۆشنکەری مانای قورئانە وای فەرمووەو بەڵگەی بەهێزە کە ئەم ڕەهایە بەو ئەندازەیەوە پەیوەند بکرێت.

## حوکمی پەیوەندار

ئەگەر پێویست بێت حوکم بەڕەها بکەین بەهەمان کێشانەو پێوانە حوکمی بەبەند دەکەین مەگەر بەڵگە هەبێت کە لابراوە وەك کەفارەتی بەدایك چوواندن (ظهار) لەئایەتی: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا/ سورة المجادلة-٤﴾ کە دەبێ دوو مانگ سەرەمڕو لەدوای یەك کابرا بەڕۆژوو بێت ئەگەر نەخۆش بوو خواردنی شەست هەژار دابەش بکات لەلایەکی ترەوە ئەگەر بەڵگە هەبوو کە بەندەکە هەڵگیراوە ئەوکاتە کار بەبەڵگەکە دەکرێت وەك وشەی (ربائب) لەئایەتی ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ/ سورة النساء-٢٣﴾ کە مەبەست ئەوەیە ئەو کۆڵەوەسەی لەمێردی پێشوو لای مێردبێت یان نەبێت لەسەر مێردی دووەم حەرام دەبێت، مەرج نییە لەماڵی مێردەکەدا بێت ئەم بەندی (في حُجُورِكُمْ) بەپێی ئایەتی ﴿فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ / سورة النساء-٢٣﴾ نەماوە. کەواتە کچی ژن ئەگەر دایکی تەڵاق درا پێش کاری ژن و مێردی لەگەڵ دایکیدا دروستە مارەبکرێ بۆ ئەو پیاوە کە دایکی تەڵاق داوە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە چووبووە لای دایکی کچەکە بەهەمیشەیی حەرام دەبێت. لێرەدا نهێنیەکی زۆر گەورەو بەنرخ هەیە، چونکە تەنها بەگرێبەندی دایك کچی حەرام نابێ، بەڵام بەگرێبەندی کچ دایك حەرام دەبێت، لەبەر ئەوەیە پیاو زۆری پێویست بەدایکی مارە براوەکەی هەیە لەبەر ئەوە دایك حەرام دەبێت لەیەکەم هەنگاوی مارەبڕین، بەڵام مارەبڕینی دایك وانییە لەنێوان زانایان جیاوازی هەیە لە کارکردن بەبەندو نەکردنی و لەسەر ئەم باسە زۆر مەسەلە هەیە بەدرێژی لەکتێبی زانایانی فیقهی ئیسلامی باس کراوە وەك (بدایە المجتهد)ج/٢/٢٩.

## لێدانەوەی ڕەها بە پەیوەند

پاش جست و جۆی زانایان و هەمەپرسی دەقەکان کە ڕەهاو پەیوەند هاتووە کە بەڵگەی کار پێکردنی پێویست نییە لەچەند نمونەیەکدا دیاری کراوە:

یەکەم/ لەکاتی یەکیەتی حوکم و هۆکارو ڕەهاو پەیوەندی بۆ کارپێکردن لەم وێنەدا دەبێ کار بەپەیوەند بکرێت لای پێشەوا شافیعیو، لای پێشەوا ئەبو حەنیفە کار بەهەردووکیان دەکرێ. نمونەش جیاوازی هەردوو پێشەوا لەسەر شایەتی فاسق، شافیعی دەفەرموێ: مارەبڕین بەشایەتی فاسق دانامەزرێ لەبەر فەرموودەی:(**لا نكاح الا بولي وشاهدي عدل**) سنن الكبرى بەیهەقی ١٢٥/٧، چونکە فەرموودەکە دەقی لەسەر ئەوەیە کە شاهید دەبێ عەدل بێت و ئەگەر عەدل نەبوو دروست نییە،



بەلأم پێشەوا ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: دروستە چونکە فەرمودەیەکی دیکە هەیە بەم دەقە (**لا نكاح الا بولي وشهود**) سبل الاسلام/ ٣/١٩٩، کە لێرەدا بەرەها هاتووەو کاری پێ دەکرێ بەهەمان جیاوازی بۆ وەلی هەیە.

دووەم/حوکمی جیاوازو هۆکار جیاوان، لەم کاتە هەرگیز رەها بەپێوەند لێک نادرێتەوە وەك: ﴿**وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا**/ سورة المائدة-٣٨﴾و ئایەتی ﴿**فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ**/ سورة المائدة-٦﴾ کە حوکمی جیاوازن ئەوەڵ برینەوە، دووەم شوشتنە مەبەستی جیاوازی یەکەم دزیە، دووەم هەڵسانە بۆ نوێژ.

لێرەدا جیاوازی دروست دەبێ لەنێوان زانایانی فیقهی ئیسلامیدا، بەلأم جیاوازییەکی بەئوصول و بەپێی یاساو ڕێسای پەسەندی خۆیان، چونکە پێشەوا شافیعی دەفەرموێ: رەها بەپێوەند لێك دەدەمەوە، چونکە بڕوای بە مەفهوم هەیەو ئیمامی حەنەفی بڕوای بەمەفهوم نییە. هەر چۆن بێت جیاوازی لەنێوان زانایانی فیقهی ئیسلامی دەوڵەمەندو فراوان کردووەو چارەسەری دۆزیوەتەوە بۆ کێشە ڕۆژانەییەکان و ئەگەر زانایەك بۆچوونێکی هەبێت و دادوەر پاش پەسەندکردنی لەلایەن دەزگای فەتواو قەزاوەتەوە پێویستە کاری پێ بکرێت و فەرمانی حاکم (خیلاف) لەناو هەڵدەگرێو جێبەجێ کردنی دەبێتە ئەرك، مەگەر حاکمێکی کە حوکمەکە بگۆڕێ بەبارێکی تردا. ئێمە بۆ زیادە روون کردنەوە کۆمەڵێك لەو یاساو ڕێساو قاعیدانە بلأودەکەینەوە بۆ زیادە زانیاری پشت بەخودا بەوردی لەم ڕێسایە بکۆڵەرەوە (ئایا دروستە بەکارهێنانی هەریەکە لەدوو وشەی هاوتاو مانا لەشوێنی یەکتری لەدەستەواژەیەکدا چەند ڕێبازێك هەیە) مختصر قواعد العلائي ج١-١٥٣- لەپەراوێزی ئەم دەقە دکتۆر مستەفا پێنجوینی بەم شێوەیە باس دەکات، زانایان لەم مەسەلەیەدا سێ ڕێبازیان هەیە:

یەکەم/ بەکارهێنانی هەر یەك لەو دوو وشە هاوتاو مانایە لەشوێنی ئەوی دی لەیەك زماندا یان لەدوو زماندا دروستە، ئەگەر مەبەستی (تعبدی) لەئارادا نەبوو ئەمەش پەسەندی سوبکی وابن حاجبە.

دووەم/ دروست نییە ئەوەش پەسەندی ئیمامی رازیە.

سێیەم/ درێژەی پێ دەداو دەڵێت: ئەگەر هاوتاو ماناکە لەیەك زماندا بوو دروستە، بەلأم لەدوو زماندا دروست نییە، بەلأم ئەم خیلافە لای (ئوصولی)یە، بەلأم زانایانی شەرع دەڵێن دروستە، وەك گرێبەندی مامەڵەکان بەهەموو زمانێ دروستەو دروستە راڤەی بکرێت هەر لەم شێوەیە کە زانایان دەفەرموون گێرانەوەی فەرموودە بەزمان دروستە لەهەمان سەرچاوەی سەرەوە ج١-١٥٤.

ئەم حوکمە لەسەر قاعیدەو ڕێسایەکی شەرعییە، کە دەڵێت جیاوازی لەلق و پۆپ دایە پاش ڕێککەوتن لەسەر رەگی ئەم لقانەی کە پەیدا بووە، جا پاش دیاریکردنی هۆکاربێت وەك ئەم دەستەواژەیە (ئاو بەرەها پاك دەکاتەوە) بەلأم جیاوازی لەلقی ئاو پەیوەند هەیە وەك لێڵ بوون بەفڕێدانی گڵ بەمەبەست یان گەڵای دارو شۆری خودی خاکەکە، لەم باسەوە ئەم (ڕێسایەمان دەست دەکەوێ (ئاوی بێ بەند ئاوێکی پاك و پاکۆکەرە) لێرەدا جیاوازی ئەگەر پەیدا بێت لەسەر ئەوەیە پاکیی ئاو لەبەر ئاوێتییە یان فەرمانێکەو تەعەبودیە ئەگەر لەبەر ئەوە بێت کە ئاوەو نازك و شەفافە هەندێ شلە هاوبەشی نابێت، ئەم جیاوازییە لە بۆچوونی زانایاندا فیقهی خلاف دەوڵەمەند کردووەو چارەسەری هەموو مەسەلە جیاجیاکانی کردووەو نرخی داناوە بۆ بیروڕاو بۆچوونی هەر زانایەك کە بەبەڵگە توێژینەوە بکات.





# ئیسلام دەتوانێ حیواری عەرەبی - کوردی ئەنجام بدات

ئازاد قادر

ماوەیەك لەمەوپێش لەهەندەران و لەئەڵمانیای کۆنە دۆستی عەرەب و تازەی کورد کۆنگرەیەکی بابەتی دانوستان- دیالۆگ-ی عەرەبی کوردیو لەسەر کێشەی کوردو لەگۆشە نیگایەکی تازەی ئیسلامیانە کۆتایی پێهاتووە، ئەم هەنگاوەش وزەیەکی تازەی بەزیاتر ئاشنا بوون بەدۆزی رەوای کورد بەخشیوە، ئەم کۆنگرەیە جۆرێکە لەپۆزش بۆ کورد کە هەتا ئێستاو رای گشتی جیهانی ئیسلامی بێ هەلوێست و بێ پەرواو بێ خەم بووە بەرامبەر بەکێشەیەکی جیهانی ئیسلامی کە کەمتر نییە لەکێشەی جوو لەگەڵ عەرەب و سیك لەگەڵ کشمیرو زلهێزی جیهانی بەرامبەر بەگەلانی بچووکی موسڵمان.

لەمێژە کورد لەخەمی برای هاودینیو هاوژینیو هاونیشتمانیو هاوسایەو هەموو هاوەکانیدا بووە، لەپێناوی کێشەی ئەم (هاو)انە کێشەی خۆی لەبیرکردبوو و کەمێکی مابوو ناسنامەو زمان و مێژوو و ژیارو کەلەپووریشی لەدەست بدات و، هەولیش درا بۆ ئەم مەبەستە، بەلام تەواو سەرکەوتوو نەبوو. کورد بۆ خەلافەتی (راشدی) کردو کوردستان بەرێکەوتن و بێ ئاژاوەو کوشتار لەگەڵ سوپای ئیسلام هاوراز بوو، خۆی سەربازو زانای تەرجومان و خاکی ئاسایشی خۆراك بوو بۆ ئیسلام، بۆ ئەمەوی کردو ماوەی نەدا کوردستان بکرێتە مەڵبەندی ململانێو دژایەتی ئەم خەلافەتەو دوا خەلیفە (مەریوان) پەنای بۆ کوردستان هێنا بەلام زۆر درەنگ بوو.

بۆ خەلافەتی عەباسی کورد پاداشتی لەیەکەم رۆژی سەرکەوتنی وەدەستهێنا لەو پاداشە چەورەی کە (ئەبو موسڵمی خۆراسانی) وەری گرت لە(السفاح)و درێژایی سالآنی ١٣٢-٦٥٦ کورد لەوپەڕی لەخۆبردن و خۆ بەبرا بچووك زان و شوێنی حەوانەوەی (سەید)و وەجاغ زادەکانی بێتە قەلآی سەخت و بێ ترس بۆیان و هەموو بنەدارێك، گۆرێك، نەزەرگەیە، شوێنەوارێکی ئەوانی تێدایەو ئێمەی کورد وەك خاڵۆمان لێ هاتبوو بۆیان و هیچ حیسابێکیان بۆ نەکردین کە پەندی خۆیان دەڵێ (للولد ثلثا خاله) هەموو خواست و سۆزو زمانەوانیو پاراستنی کەلەپور و نەریت هەیە بۆ ئێمەیان بەرەوا نەدەزانی و کار گەیشتبووە ئەوە هەر کەس شایەتومان بەعەرەبی بێنێو ناوی عەرەبی بێت و بەرەچەڵەك و دەزوویەکی یاریك بگاتەوە سەر بارێکی پێغەمبەر(د.خ) ئەوە تانوپۆ لەخۆیانە، ئەوەی بۆ عەرەب کردومانە ئەگەر بۆ هەر نەتەوەیەکی دیکە بکرایە ئێستا لەرەوش و بارودۆخێکی دیکەدا دەبووین. لەبەرئەوە مەسەلەکە ئەمڕۆ دیالۆگی عەرەب و کوردە باسی خزمەتی کورد بۆ فارس و تورك لەگۆرێدا نییە دەنا بۆ ئەوانیش کەم نەکراوە، لەخۆشەویستی کورد بۆ عەرەب تەنها یەك هەنگاو مابوو بۆ توانەوەمان و لابردنمان لەسەر نەخشەی نەتەوەکانی ئیسلامی غیرە عەرەب بەخاك و مرۆڤ و مێژوو و نەژادەوە.





لەبەر ئەوە ئێمەش مافی خۆمانە ئەمڕۆ لەژێر دەواری ئیسلامدا داوای کیان و قەوارەو چوارچێوەی ماف بکەین، چونکە ئەرکی خۆمان ئەنجامداوە تەنها ماوە ماف وەربگرین، زمانی سیاسەتی ئەمڕۆ زمانی دیالۆگ و حاڵی بوون سەرچاوەی بڕیارەو لەدێر زەمانەوە گەلانی پێش ئێمە لەم ڕێگەوە کاروباری خۆیان ئەنجامداوەو رای گشتی فاکتەری هێزی رای دەوڵەت و دەسەڵات بووەو لەشەقامەوە بۆ پەرلەمان و لەپەرلەمانەوە بۆ ناوەندی بڕیار.

ئەم کۆنگرەیە دەبوو زووتر ببەسترایە لەوکاتەی عیراق بۆ مەبەستی زڕاندنی ناوی ئێران لەم جۆرە کۆبوونەوەی دەبەست و بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەوکاتەش کورد لەتەنگژەو میحنەت و دەردو ئەنفالدا دەژیاو خیتابی سیاسیو وڵاتە ئیسلامییەکان بەدوو جۆرەمەن پێوانەی دەکرد ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ *الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ* وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ* أَلاَ يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ* لِيَوْمٍ عَظِيمٍ/ سورة المطففين/ ١-٥﴾ بۆ کێشە رەواکانی خۆیان هەموو شتیان دەکرد، بەڵام بۆ کورد حیسابی کۆیلەو بەندەو کەنیزەك و دەستکەوتی جەنگ دەکرا، کەواتە دەبوو نوێنەری کوردستان ئەو ڕاستییە تاڵە بەرووی جیهان ئاواڵا بکردایە بۆ برایانی موسڵمانیش باس بکرایەو بۆ ئەوەی ئەوانیش هەڵوێست وەربگرن، بەڵام پێدەچێ لای ئەم کۆنگرە تەنها کوردی هەندەران بۆی هەیە لە حیوار بەشدار بێت، دیارە مەبەست کارکردنە بۆ شەقامی عەرەبی ڕۆژنامەوانی عەرەبی، عەقلی عەرەبی، قەڵەمی عەرەبی، هۆشیاری ئیسلامی گۆڕەپانی نیشتمانی عەرەبی دەنا ئێمە لەمێژە ناسراوین بەستەملێکراو، ژێردەستی نەتەوەیەکی ژێر دەست، زەوی داگیرکراو لەلایەن نەتەوەی کە بەدەست زەوی داگیرکردنەوە نیو سەدەیە دەناڵێنێو ئازارو ژان دەچێژێ.

**ئەم کۆنگرەیە جۆرێکە لەپۆزش بۆ کورد کە هەتا ئێستاو رای گشتی جیهانی ئیسلامی بێ هەڵوێست و بێ پەرواو بێ خەم بووە بەرامبەر بەکێشەیەکی جیهانی ئیسلامی**

---

**کورد خۆی بوو بەسەربازو زانای تەرجومان و خاکی ئاسایشی خۆراك بۆ ئیسلام**

---

**ئێمەش حەقمانە ئەمڕۆ لەژێر دەواری ئیسلامدا داوای کیان و قەوارەو چوارچێوەی ماف بکەین، چونکە ئەرکی خۆمان ئەنجامداوە ماوە ماف وەربگرین**

کورد لەمێژە بەهەموو جۆرێك خۆشەویستی عەرەب لەدڵ و دەروون و هەست و نەستی ڕۆڵەکانی خۆیدا دەڕوێنێو بەبرایەتی کوردو عەرەب دەخوێنێ، سروودو گۆرانی بەباڵایدا دەڵێ ماوە برایانی عەرەب وا نەزانن ئەوە ئەرکی خودایە لەسەر کورد بەتەنها واجبەو مافی وەلامدانەوەی نییە، لەوانەیە هەندێ زانای خۆ بەزلزانیان بڵێن جا کورد چییە هەتا لەگەڵ ئێمە حیوار بکەن، ئێمەش دەڵێین: (لیس منا من لم یرحم صغیرنا) ئەرکی برای گەورەیە ئەگەر برای بچووك (بالغ و عاقل و رەشید) بوو هەموو ماڵ و سامانەکەی کەپێی سپاردووە تەسلیمی بکاتەوە، چونکە بە(هەتیوی نەماوەتەوە)و لەسەر خاکی خۆی ئەرکی ئیسلامی خۆی ئەنجام دەدا.





# جەوهەری ڕۆژوو لە ئیسلامدا



مەلا ڕەشید گەردی

ڕۆژوو لەزاراوەی زمانی عەرەبیدا بریتییە لەوازهێنان لەشتێك. لەزاراوەی زانایانی شەرعدا بریتییە لەوازهێنان لەخواردن و خواردنەوەو سەرجێیی‌و جووتبوون لەکازیوەی بەیانییەوە هەتا ڕۆژ ئاوابوون بەمەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە...

یەکەم بەڵگە واجب بوونی ڕۆژوو ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا کُتِبَ عَلَیْکُمُ الصِّیَامُ کَمَا کُتِبَ عَلَی الَّذِینَ مِنْ قَبْلِکُمْ لَعَلَّکُمْ تَتَّقُونَ* أَیَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ کَانَ مِنْکُمْ مَرِیضًا أَوْ عَلَی سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَیَّامٍ أُخَرَ.../ سورة البقرة-١٨٣-١٨٤﴾ واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە. ئەی بڕواداران ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە هەروەکو لەسەر بڕوادارانی پێش ئێوەش فەرزکرابوو. تاکو بگەنە پلەی تەقوا) کەواتە، پەروەردگار بەم ئایەتانە ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر موسڵمانان فەرز کردووە. چۆنیەتی ئەنجامدانی‌و ئەندازەو سوودو پاداشتەکانی ڕوون کردۆتەوە. دەی باپێکەوە ساتێك بەوردی جارێکی تر بەئایەتەکاندا بچینەوەو بزانین چیمان بۆ وەدەردەکەوێ. سەرەتا کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا کُتِبَ عَلَیْکُمُ الصِّیَامُ کَمَا کُتِبَ عَلَی الَّذِینَ مِنْ قَبْلِکُمْ...﴾ ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە فەرزکردنی ڕۆژوو یاسایەکی ئاسمانی تازە نییە بۆ ئادەمیزاد. بەڵکو یاساو تەشریعێکی کۆنە بۆ کۆمەڵانی ئادەمیزادی پێش ئێمەش. واتە: لەیاساو بەرنامەی هەموو پێغەمبەرێکدا ڕۆژوو هەبووە. ئاشکراشە کە ئەوە قورسایی ئەرکی ڕۆژوو سووك دەکاو ڕێگای پەیڕەویکردن و جێبەجێ کردنی ئاوەڵا دەکاو موسڵمانان هەست بەوەناکەن کە داوای شتێکی تازە قەڵای نابەجێیان لێکراوە. بۆیە زۆر بەدڵفراوانییەوە وەریدەگرن و فەرمانەکە جێبەجێ دەکەن. ئەمجار خوای گەورە دوا بەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّکُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەوەش مەبەست و کاکڵەو پوختەی ڕۆژوومان بۆ ئاشکرا دەکاو ڕوح و جەوهەری ڕۆژوو لەئیسلامدا چییە پێمان دەفەرموێ‌و داوامان لێدەکا کە ئێمە ڕۆژوو بکەینە مەتاڵ و سەنگەرو خۆمانی تێدا حەشاردەین و بیکەین بەلەنگەرو بەرگرو بەربەست. هەتا ڕۆژوو نەهێڵێ بکەوینە زوڵگاوی کاری نابەجێوە. ئارەزوو و هەواو هەوەسمان لەخراپەکاری بگەڕێنینەوە،





چونکە لەراستیدا رۆژوو مەتاڵەو سەنگەرە. ئینسان دەپارێزێ لەوەی کە ببێتە ئاژەڵێکی گەدە پەرست و بەشەریعەتی بیشەڵان (شریعة الغاب) کاربکات. کۆمەڵیش دەپارێزێ بەوەی کە تاکەکانی وا پەروەردە دەکا کە هەموویان راستاڵ و سووا، بەخش بن. وا هەست بکەن کە ئادەمیزادن و لەگەڵ ئادەمیزاددا کاری ئینسانی دەکەن. نەك بەئارەزوویەکی ئاژەڵییەوە کاری ئاژەڵی ئەنجام دەدەن. هەر لەم رووەوەیە کە پێغەمبەری خودا(د.خ) دەفەرموێت: (انما الصوم جنة. **فاذا كان احدكم صائماً فلا يرفث ولا يجهل وان امرؤ قاتله أو شاتمه فليقل اني صائم اني صائم)** واتە: ( رۆژوو مەتاڵەو قەڵغانە موسڵمان لەخراپە دەگێرێتەوە. دەتپارێزێ، لەچ دەتپارێزێ؟ لەخراپە لەفەساد لەکاری بەدو نابەجێو لەبەدرەوشتی. دەفەرموێ هەر یەکێك لەئێوە کەبەرۆژوو بوو باقسەو گۆتەی ناشیرینی لەدەم دەرنەچێو کاری بێعەقلانە نەکات. ئەگەر یەکێکیش شەڕی لەگەڵدا کرد یان جوێنی پێدا بابڵێ: من بە رۆژووم من بەرۆژووم) کە دەڵێن رۆژوو مەتاڵە، واتە پارێزەرەو ناهێڵێ خاوەنەکەی بکەوێتە سەر رێگای چەوت و لار. واتە دەبێ ئینسان وا هەستبکا کە رۆژووەکەی ناهێڵێ کاری ئاژەڵی بکاو لەکرداری خراپ دووری دەخاتەوە. کە دەڵێ (کاکە من بەرۆژووم) ئەوە دەدات بەگوێچکەی بەرامبەرەکەیدا کە ئەو بەرگی بێوەیی مرۆڤایەتی بەراستی پۆشیووە، نەك گورگەو لەپێستی مەڕدا. هەر کاتێکیش مرۆڤ خۆی لەشەڕی نەفسی خۆی پاراست و کۆمەڵیشی پاراست ئەوە گەیشتۆتە جێی رەزامەندی خوای گەورەو لەرێزی تەقواکاراندا دەژمێردرێ. ئەوەش بە کورتی مانای رستەی ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ە کە مانای وشەی (لَعَلَّ) لێرەدا حازرکردن و پەروەردەکردن دەگەیەنێ ئاشکراشە پەروەردە کردنی دەروون و نەفسی رۆژووەوانان بەهۆی رۆژووەوە بۆتە تەقوا کاریو لەخواترسان لەچەند رووێکەوە دەردەکەوێ لەهەموویان گرنگتر ئەوەیە کە کاری رۆژوو کارێکە پەیوەندی بەخودی رۆژووەوانەکەوە هەیە. جگە لەخوای گەورە کەسی تر نییە کە بەسەریەوە چاودێر بێ. جا ئەگەر رۆژووەوان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە وازی لەخواردن و خواردنەوە هێنا. بەراستیو بەبڕوایەکی پتەو لەبەر رەزامەندی خودای گەورە نەبەدزیو نەبەئاشکرا سنووری دیاری کراوی رۆژووی نەبەزاندو نەفسی خۆی راهێنا بەسەر خۆڕاگریو وازی لەو خۆشیو ئارەزووانە هێناو باوەڕی وابوو کە خوای گەورە چاودێری دەکاو ئاگاداری نهێنیەکانییەتی تا ماوەی مانگێگ ئەم دیاردەیەی پێوە دیاربوو. ئەوە بێگومان لەدوو بارەبوونەوە و سێبارە بوونەوەی ئەو حاڵەتە. مەلەکەی لەخواترسان و شەرم لەخواکردن و هەست بەلێپسراوی کردن بەرامبەر خوای گەورە پەیدا دەبێو دەتوانێ زاڵبێو سەرکەوێ بەسەر هەواو ئارەزووە نەفسانیدا. ئەم حاڵەتەش وای لێدەکات کە بگونجێ لەگەڵ هەموو کارێکی خێرو چاکەداو دوورە پەرێز بێ لەشەڕو کاری شەڕئامێزدا. ئیتر فێڵ و خیانەت ناکات و زوڵم و زۆرداری بەرەوا نابینێ حەقی کەس ناخواو هەوڵ و کۆششی خراپەکاریو فەساد نادات. کارێکیش ناکات دژایەتیو دووبەرەکی بخاتە ناو موسڵمانانەوە. بەڵام تەنها وازهێنان لەخواردن و خواردنەوە، بەبێ هەست کردن بەچاودێری خوای گەورە دەبێتە رێگا خۆشکەر بۆ گوناهو تاوان و ئەنجامدانی تاوانی گەورە. کەوابوو رۆژووی ئاوا ئەو رۆژووەنییە کە خوای گەورە




فەرزی كردووە لەسەر موسڵمانان. جا لەم روانگەیەوە ئیمامی بوخاری فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری رەحمەت(د.خ) دەفەرموێ: (**من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه**) واتە: (ئەو رۆژووانەی واز نەهێنێ لەقسەی كاری نارەوا خوای گەورە كاری بەوە نییە كە دەمی خۆی ببەستێو واز لەخواردن و خواردنەوە بهێنێ) كە وابوو كاكڵەو پوختەی رۆژوو لەئیسلامدا هەستكردنە چاودێری خوای گەورەو هەستكردنە بەوەی كە دەبێ رۆژوو راست و ساخ بۆ خوای گەورەبێ. بەڵگەش بۆ ئەوە، ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوایە كە دەفەرموێ: (**من صام رمضان إيماناً واحتساباً غفر له ماتقدم من ذنبه**) (رواه البخاري والمسلم) واتە هەر كەسێك بۆ رەزامەندی خوا بەئیمان و بڕوایەكی تەواو بەرۆژوو ببێ خوا لەهەموو گوناهی رابردووی خۆش دەبێت، لەلایەكی ترەوە رۆژوو دەروونی رۆژووەوان ئامادە دەكات بۆ خوای گەورە كە بیپەرستێ. لەم رووەوە كە رۆژوو هەواو هەوەس و هێزی ئارەزوو بازی لاواز دەكاو شەهوەتیش یان هەواو هەوەس كە سەرچاوەو كانگەی گشت گوناهو تاوانێكە. ئەوەتا پێغەمبەرمان حەزرەتی محەممەد مستەفا(د.خ) دەفەرموێ: (**يا معشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فانه اغض للبصر واحصن للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم فانه له وجاء**) (رواه مسلم) واتە: (ئەی دەستەی لاوان. هەر كەسێكتان توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ. چونكە ژن هێنان چاوی تێر دەكاو داوێنی لەگوناهو تاوان دەپارێزێ. بەڵام ئەو كەسەی كە ناتوانێ ژن بهێنێ با بەرۆژوو بێ. چونكە رۆژوو ئارەزووی نێرو مێیی لاواز دەكات) كەوابوو رۆژوو هەواو هەوەس و هێزی ئارەزووبازی لاواز دەكات و ناهێڵێ موسڵمان تووشی تاوان و گوناهو بەدرەوشتی ببێ..

## سوودو پەندو بەهرەی رۆژوو

سوودو حیكمەتی رۆژوو زۆرن چ لەبارەی كۆمەڵ و كۆمەڵایەتییەوە چ لەبارەی تاكە كەسییەوە. یەكێك لەو سوودانەی رۆژوو بەزەیی و رەحم هاتنەوەیە بەفەقیرو هەژاراندا، چونكە ئینسانی بەرۆژوو كاتێ برسی دەبێ هەست بەئازارو ناخۆشیو برسێتی دەكات. ئەو حاڵەتە پاڵی پێوەدەنێ بۆ ئەوەی بەزەیی بێتەوە بەهەژاراندا. چونكە بەزەیی لەئینساندا لەئازارو نارەحەتییەوە سەرهەڵدەدات. رۆژوو خۆی لەخۆیدا رێبازێكی ئاساییە بۆ پەروەردەكردنی بەزەیی لەدڵ و دەروونداا. جا هەر كاتێ بەزەیی هاتنەوە بەهەژاران لەدڵی دەوڵەمەندا جێگیر بوو رەگی خۆی داكوتاوە ئەوە لەناخەوە هەستی بەرامبەر بەلێقەوماوان دەجووڵێو بەخشش و خەڵاتی بەرفراوان دەبێ بۆ هەژاران. هەر لەبەر ئەوەشە زانایان دەفەرموون: ((پێغەمبەری خۆشەویستمان(د.خ) لە هەموو كەس سەخیتر بووە. لەمانگی رەمەزانیشدا لەهەموو كاتێك زیاتر سەخی بووە)).

سوودێكی دیكەی رۆژوو ئەوەیە كە بەكردەوە نەك هەر بەقسە، یەكسانی دەهاوێتە نێوان دەوڵەمەندو هەژارانەوە، هەردووكیان وەكو یەك لەبەیانییەوە تائێوارە برسێن و بەرۆژوون كەوابوو رۆژوو یاسایەكی ئاساییە زۆر رێك و پێك ترە لەیاسا ئیشتراكییەكان. بەڵێ رۆژوو هەژارییەكی زۆرە ملێیەو ئایینی ئیسلام وەك یەك لەسەر هەموو موسڵمانانی داناوە تاكو هەموو كەسێك لەناخ و لەدەروونەوە هەست بەئازاری نەداری بكات. تاتێیان بگەیەنێ كە ئیشتراكیەتی راستی كاتێك دێتەجێ كە هەموو كەس




لەهەست و شعوردا وەك یەك بن، نەك هەر مەلەی لەئاوازێك و هەست و ئارەزوەك جیاجیا لەیەك تەرازایان بكات. كاتێك ئیشتراكیەت و هاوسانیو یەكسانی دێتەجێ كە ئەندامەكانی كۆمەڵ هەست بەئێش و ئازاری ماددیو مەعنەوی یەكتری بكەن. نەك لەسەر بەرژەوەندی تایبەتی تووشی بگرەو بەردەو كێشەی كۆمەلأیەتی زۆر بن. بەهرەیەكی رۆژوو ئەوەیە كە دەسەلأتی عادەت و خوو پێوەگرتن زەلیل و زەبوون دەكات. چونكە كەسانێكی واهەن وا ملكەچی عادەت و خووبووینە دەلێی بەو داب و نەریتانەوە لكاون، هیچ هێزی گۆڕانیان نییە. بۆ نموونە هەندێك كەس هەن ئەگەر چایە نەخۆنەوە یان جگەرە نەكێشن تووشی سەرئێشەو نارەحەتی دەبن و بەتەواوی هەڵسوكەوتیان دەگۆڕێ. بەلأم كاتێك كە بەرۆژوو دەبن زاڵدەبن بەسەر ئەم عادەت و خوەداو بەبێ ئەوەی هیچ هەڵسوكەوتیان بگۆڕێ. كەوابوو رۆژوو عەزم و جەزم بەموسڵمان دەبەخشێ.

سوودێكی دیكەی رۆژوو بەهێز كردنی ویست و ئیرادەیە، چونكە رۆژوو رێبازێكی عەمەلییە بۆ بەرەنگاری كردنی هەواو هەوەس. تۆ بەسەر گەورەترین دوژمن زاڵدەبیت كە نەفسە. ((مامۆستای بەناوبانگی ئەڵمانی (جیهاردت) كتێبێكی دەربارەی بەهێزكردنی ویست و ئیرادە داناوە لەم كتێبەدا رۆژووی كردووە بەبناغەو كۆڵەگەی ویست و ئیرادە. بەقەناعەتەوە دەڵێ: رۆژوو هۆكارێكی كاریگەرە بۆ چەسپاندنی دەسەلأتی روح بەسەر لەشدا، بەهۆی رۆژووەوە ئینسان جڵەوی نەفس و ئارەزووی خۆی بەدەستەوە بێو نابێتە ملكەچی ئارەزووە مادییەكانی)). كەوابوو بێ گومان رۆژوو چارەسەرێكی سەركەوتووە بۆ زۆر نەخۆشی دەروونیو كۆمەلأیەتی، جگە لەسوودی زۆرو زەبەندەی بۆ لەش و جەستە كە رۆژوو بەراستی پێش هەموو شتێك عیبادەتێكی زۆر گەورەیەو وێستگەیەكی خواییە كە كردوویەتی بەهۆكاری لێخۆشبوون لەهەموو گوناهەكانی رابردوو..






# ئیسلام پەیامی لێبووردەیی نەك توندو تیژی

م. عومەر محەممەد

لەگەڵ زۆربوونی قەیرانەکان و زیادبوونی توندو تیژی‌و سەرهەڵدانی هەڕەشەکانی تیرۆریزم و زۆربوونی چەوسانەوەی مرۆڤ لەژێر جۆرەها ناوو ڕوشمدا، ئیسلام وەك پەیامێکی فریادڕەس بۆ مرۆڤایەتی‌و چارەسەرێکی گونجاوو روون بۆ سەرجەم ئەو قەیرانانە دەکرێ جارێکی تر چاوی پێدابخشێندرێتەوەو وەك پەیامێکی خوایی مەزن بۆ مرۆڤایەتی سەیر بکرێت و بگەڕێینەوە بۆ دەقە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودەو رای زانایانی ئیسلام، بۆ ئەوەی بتوانین کۆمەڵگایەکی لێبووردەو هاوکارو خۆشگوزەران بنیات بنێین. خوای گەورە کاتێك کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ/ سورة الانبياء-١٠٧﴾ لێرەدا مەبەست تەنها خەڵکی موسڵمان و ئیماندار نییە. بەڵکو ئیسلام سۆزو بەزەییە بۆ گشت مرۆڤایەتی بەکافرو موسڵمانەوە. سەرەتا ئەو سۆزو بەزەییە لەنێوان پارچەکانی بوونەوەرەوە دەستپێدەکات لەدروستکردنی ژیان و هەسارەکان. کەخوای گەورە دەزانێت کە ئەو زەویە کافرو موسڵمانی لەسەر دەژی، بەڵام لەهەمان کاتدا ژیانی قەدەغە نەکردووە لێیان، بەڵکو ئازادی تەواوی لەژیاندا پێداون، چونکە گەورەیی پەیامی خوا لەوەدایە، کە لەگەڵ ئازادیدا پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ/ سورة الكهف-٢٩﴾ یان دەفەرموێت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ/ سورة البقرة-٢٥٦﴾ وەك یەکێك لەراڤەکارانی قورئان (مفسر) دەفەرموێت: ئەم ئایەتە گەورەترین دروشمی بڕیاردانی ئازادییە بۆ مرۆڤ. چونکە ئەوەی ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران بووە ئەوەیە کە بەگیانی خۆشەویستی‌و لێبووردەییەوە پەیامەکەیان بگەیەنن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ/ سورة ال عمران-١٥٩﴾ بەڵام لەسەر لێبووردەیی پێغەمبەری خواو نەرم و نیانی هەڵسوکەوتی‌و گرنگیدان بەسۆزو خۆشەویستی خەڵك رۆژ بەرۆژ پەیامەکە گەشەی سەندو بەرەوپێشەوە چوو. چونکە پەیامی ئیسلام پەیامی رێنماییی‌و هەوڵدانە بۆ رزگاری کردنی خەڵك لەدۆزەخی دونیاو رۆژی دوایی. نەك دروست کردنی دۆزەخێك بێت لەدونیادا بۆ خەڵك. بەڵکو دەبێت ئەم ئیسلامە پەیامێك بێت بۆ رزگاری لە هەردوو دونیادا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ/ سورة الرحمن-٤٦﴾ هەندێك لەموفەسرین دەڵێن ئەوە مانای بەبەهەشت کردنی دونیاو ئاخیرەت دەگەیەنێت. واتە لەدونیادا ئەم ئیسلامە ببێتە مایەی خۆشگوزەرانی‌و پێکەوەژیان و خۆشەویستی‌و چارەسەربێت بۆ گشت قەیرانەکانی مرۆڤایەتی، ئیسلام هەڵگری کۆمەڵێك چەمکی مرۆڤ دۆستانەی زۆر گەورەیە کە گرنگترینیان دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنییە وەك زاراوەی تازە و وەك زاراوەیەکی ئیسلامیش پێی دەوترێت: (تسامح)و هەر پیادەکردنی ئەم چەمکەش بوو کە پەیامی ئیسلامی گەیاندە هەموو گەلانی جیهان و بەخۆشەویستییەوە زۆربەی گەلان موسڵمان بوونی خۆیان راگەیاند. ئەمەش بووە ئەزموونێکی گەورە بۆ دادپەروەری‌و رەوشت و




جوانی‌و خۆشەویستی و لێبوردەیی. هەر بەپیادەکردنی ئەم مانا جوانانەی ئیسلام بوو کە هەردوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی‌و رۆمانی هەرەسیان هێناو نەیانتوانی لەبەردەم ئیسلامدا خۆیانبگرن. ئەمڕۆش کاتێك کە دەمانەوێت باس لەئیسلام بکەین و جارێکی تر بانگەوازی ئیسلامی بڵاوبکەینەوە دەبێت هەمان رێباز بگرینەبەر، چونکە هەر لایەن و دروشمێك پەنابەرێت بۆ ترس و تۆقاندن، نیشانەی ئەوەیە هەڵگری پەیامێکی لاوازە و لە ئازادی دەترسێت، کە ئەمەش هەرگیز لەگەڵ سیما جوانەکانی ئیسلامدا ناگونجێت و دەربڕی گیانی لێبووردەیی قورئان و سونەتەکانی پێغەمبەری خوا نییە. ئیدی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەرەو پێشدەچوو هەتا وای لێهات بووە پەیامێکی گەردوونی هەمیشە زیندوو، پێغەمبەری خوا لەفەرموودەیەکدا دەفەرموێت: خوای گەورە فەرموویەتی **(أسمحوا لعبدي كسماحه الى عبادي)** واتە تۆ چەند لێبووردە بیت لەگەڵ خەڵکدا خوای گەورەش بەرامبەرت ئەوەندە لێبووردە دەبێت. کە ئەمەش مانایەکی گشتییەو دەبێت لەتاك و دام و دەزگاکانی دەسەڵاتیشدا رەنگ بداتەوە. لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (السماح الرباح) واتە کەسی خاوەن لێبوردە براوەیەو قازانجی کردووە. یان لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: **(اني ارسلت بحنفية بسمحة)** ئەوەش لەرووێکەوە مانی روونی‌و رۆشنی‌و مرۆڤ دۆستی پەیامی ئیسلامە، کە نابێت هیچ جۆرە توندو تیژی‌و سەپاندنێکی تیابێت. ئەوەش رێنماییەکە بۆ هەڵگرانی مەشخەڵی ئیسلام. کە دەبێت ئێمە بەپێی ئەم رێنماییانە هەڵسوکەوت بکەین، چونکە دەبینین لەباسکردنی ئیسلامدا تەنها رەزامەندی خوا لەبەر چاوبگیرێت و بە ئەو شێوەیەش بێت کە ئەو داوای کردووە، وەك دەفەرموێت: **﴿وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا.../ سورة الحشر-٧﴾** واتە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا(د.خ) بۆی هێناون و فەرمانتان پێدەکات وەری بگرن و ئەوەش کە رێگریتان لێدەکات وازی لێبێنن. چونکە پێغەمبەری خوا وەحی دەگەیەنێتە موسڵمانان و لەخۆیەوە هیچ نالێت: **﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنْ الْهَوَى* إنْ هُوَ إلاَّ وَحْيٌ يُوحَى* عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى/ سورة النجم-٣-٤٥﴾** واتە پێغەمبەر لەخۆیەوە هیچ نالێت هەتا وەحی لەلایەن خواوە بۆ نەیەت. لەبەر ئەوە دەبێت هەر لەم روانگەیەوە مامەڵە لەگەڵ ئیسلامدا بکرێت و تێکەڵ نەکرێت بەئامانجی تاکە کەسی‌و بەرژەوەندییە بەرتەسکەکانی لایەنە جۆربەجۆرەکان، چونکە بەمە ئیسلام بچووك دەبێتەوەو ئەو سۆزو خۆشەویستی‌و لێبووردەیە گشتی لەدەست دەدا کە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. قورئانیش زۆر جەخت لەسەر ئەم چەمکە دەکاتەوەو وەکو بنەمایەکی گرنگی مامەڵە لەبواری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی باس دەکات، کە ئەمەش لەچەسپاندنی







## ئیسلام پەیامێکە بۆ پێکەوە ژیان و بۆ کەم کردنەوەی گرژی‌و ناکۆکییەکان

دادگەری‌و کۆمەلأیەتی‌و ئازادی واباس دەکات و مێژووی سەدەکانی ئیسلامیش شایەدی چەسپاندنی ئەم چەمکانەن، ئەمەش وەك سەرچاوەیەکی شەریعەتەو دەبێت لەسەرووی دەسەلأتی سیاسیەوە بێت، هەر لادانێکیش لەم مانایانە مانای لادان لەئیسلام دەگرێتەوەو دەسەلأتەکانی بەرەو ستەمکاری دەبات، چونکە ئیسلام فەرماندەکات بەچاکەو ئەو چاکەکردنەش دەبێت بچێتە نێوان هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیان لەسیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلأیەتی. چونکە ئامانجەکانی ئیسلام ئەو ئامانجانەن کە بەدرێژایی مێژوو، مرۆڤایەتی خەباتی بۆ کردووەو دژی ستەمکاری وەستاوەتەوە، ئەم ئامانجە بەرزانەش خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ**/ سورة النحل-٩٠﴾ کە ئەمەش پشتگیری کردنە لەهەموو دادپەروەرییەك، یان دەفەرموێت: ﴿**ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**.../ سورة المؤمنون-٩٦﴾ ئەمەش مانای وایە ئیسلام لەسەر کاردانەوە هەلوێستی دانارێژێت بەلکو هەلوێستی ئیسلام کە وەلأمدانەوەیە بەچاکە شتێکی روون و ئاشکرایە وەك دەفەرموێت: ﴿**وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا**.../ سورة الانفال-٦١﴾ کە تیایدا داوا دەکات بەهەموو شێوەیەك موسلمان دەبێت رەمزی ئاشتی‌و چاکەو لێبووردەیی بێت.

یان دەربارەی ئەهلی کتاب دەفەرموێت: ﴿**وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**.../ سورة العنكبوت-٤٦﴾ واتە دەبێت باشترین هەلوێست لەبەرامبەر ناموسلمانانیشدا بنوێنرێت. کەواتە ئەگەر بەرامبەر ناموسلمان بەو شێوەیە مامەلە بکرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ**.../ سورة ال عمران-٦٤﴾ واتە دەبێت ئێمە بگەڕێین بۆ خالی هاوبەش لەگەل ناموسلمانانیشدا. ئەویش لەپێناو پاراستنی ئاشتی‌و ئاسایش و رێگرتن لەتوندوتیژی، بەمەشدا دەردەکەوێت کە ئیسلام پەیامێکە بۆ پێکەوە ژیان و بۆ کەم کردنەوەی گرژی‌و ناکۆکییەکان، لەبەر رۆشنایی ئەم دەقە پیرۆزانەشدا بووە کە هەتا ئێستاش لەجیهانی ئیسلامدا خاوەن کتێبە پیرۆزەکان و ئایینەکانی تر بەئازادی عیبادەتی خۆیان دەکەن و ئازادی لەهەموو رووێکەوە، ئەمڕۆ دەتوانین سوود لەم چەمکە وەربگرین بۆ دانانی بەفرە لایەنی‌و دیموکراسی‌و دروستکردنی کۆمەلگایەکی مەدەنی پێشکەوتوو، بۆ ئەوەی کۆمەلگا موسلمانەکانیش لەژێر سایەی ئیسلامدا بتوانن کۆمەلگایەکی ئاسوودەو دوور لەتوندو تیژی بنیات بنێنن و لەرێگەی بڕوابوون بەئازادی بیروڕادا ئەم ئایەتە لەواقیعدا بچەسپێندرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**.../ سورة النحل-١٢٥﴾ بۆ ئەوەی موسلمانان بیسەلمێنن کە خاوەنی پەیامێکی پیرۆزو گەورەی مرۆڤایەتین و ئیسلامیش دەتوانێ کێشە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ چارەسەربکات، ئەمەش دەبێت لەعەقل و رەوشت و هەلوێستی تاکی موسلماندا رەنگ بداتەوە، ببێتە شایەتێکی بەرجەستە لەسەر مانای ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ**/ سورة فصلت-٣٣﴾ ئەوکاتەش ئیسلام دەبێتە ئەو ئایینەی کە هەموو کەس رێزی لێدەگری‌و خۆشەویستی لەدلدا دروست دەبێت.




# تیشکێك بۆ کەلتووری ئیسلامی

بەشی دووەم

هەیفاء ئەنوەر بەرزنجی

١. هۆشی مرۆڤ لەتوانایدا نییە دەستکاری زانستە شاردراوەکان (الغيبيات) بکات، ئەوە کارێکە پێغەمبەرمان(د.خ) بۆی نەکراوە، ئێمە چۆن بۆمان دەکرێ. بەڵکو بیری مرۆڤ تەنها دەتوانێ ئەو تێکستانە شی بکاتەوەو ئیمانیان پێ بهێنێ یان نا، چونکە ئەوە بەرپرسیارێتیکی گەورەیە.

ئیمان هێنانیش تەنها کەسێکی کامڵ و هۆشمەند دەیکات، لێرەشدا دەتوانین بڵێین سەربەستی ئایین لەئیسلامدا هەیە. مرۆڤیش دەتوانێ ببینێ‌و بیربکاتەوەو راستییەکان هەڵبژێرێ، لەسۆنگەی ئەو کارانەشیدا لەرۆژی قیامەت لەبەرامبەر پەروەردگارەوە کەسێکی بەرپرسە، ئەو رۆژەی کە هیچ کەس لەکەسی تر باشتر نییە.

٢. مرۆڤ ناتوانێ دەست لەکاروباری شەریعەت بدات و پەرستن (العباد) بەئارەزووی خۆی دابەش بکات، بەڵکو ئەوە مافی خوایە بۆ سەر بوونەوەرەکانی.

خوای گەورە کاری هەر جۆرێك پەرستن و چۆنیەتی ئەنجامدانی دیاریکراوە. پێغەمبەریش(د.خ) ئەو جۆرە پەرستنانەی بۆ خەڵك لەلایەنی تیۆری‌و پراکتیکییەوە روونکردۆتەوە، کە چۆن خەڵکان بەباشترین رێگا ئەنجامی بدەن.

هەندێك پەرستن هەیە دەبێ لەکاتی دیاریکراوی خۆی ئەنجام بدرێت وەکو نوێژو رۆژوو و حەج. هەندێکیش هەن دەبێ لەشوێنی دیاریکراوی خۆیان ئەنجام بدرێت وەکو چۆنیەتی حەج کردن کە دەبێ لەکاتی نوێژکردندا بەرامبەر بەکەعبەی پیرۆز بوەستین. هەروەها لەبارەی رێژەو ژمارەشەوە پەرستن کاری خۆی دەکات، وەکو ژمارەی روکوعەکان لەنوێژو ژمارەی رۆژەکانی بەرۆژووبوون لەرەمەزان و کاتی حەج.

مرۆڤیش هەر ئەوەندەی لەدەست دێت گوێڕایەڵی فەرمایشتەکانی پەروەردگار بێت کە چۆنی بۆ داناون و چی پێ راگەیاندون.

٣. مرۆڤ تەنها دەتوانێ دەست لەچۆنیەتی هەڵسوکەوتەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بدات، وەکو پەیوەندی‌و هەڵسوکەوتی نێوان مرۆڤ خۆی یاخود لە نێوان گیانلەبەرو رووەك و شتی تر.

پێشتر مرۆڤ هەر گفتوگۆو دەمەتەقێی لەسەر ئەو بابەتانە دەکرد کە تێکست نەبوون یاخود لەلایەن پەروەردگارەوە نەهاتبوون. ئێمەش دەبێ هەر بەوجۆرە بین و، هیچ شتێکی نوێ تێکستی بۆ نەهاتۆتە خوار، دەبێ ئێمە خۆمان ئەحکام و یاساو پێوانەی بۆ دابنێین.

### * هۆشی مرۆڤ لە بەرایی راگەیاندنە

هەندێ لەزانایانی ئوسولی فیقهی وەکو: (الحنبلين الطوفي) بۆ ئەوە چووە ئەگەر بیری مرۆڤ نەیتوانی پەیوەندی نێوان تێکستە ئایینییەکان و بەرژەوەندییەکان روون بکاتەوەو هاوسەنگیان بکات، ئەوا بێگومان بەرژەوەندییەکە پێش دەکەوێ‌و زاڵتر دەبێ.. بەو واتایەبێ شەریعەتێکی نوێ دادەنێن، کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکان بگونجێ. مەبەستەکەش ئەوەیە پەروەردگار بەرژەوەندی بەندەکانی خۆی رەچاوکردوەو زیاتر ساناکردنی باسەکە ئەو نمونەیەی خوارەوە دەهێنمەوە:-

شەریعەتی ئیسلامی لەدەستکەوتەکانی شەڕدا چەند تێکستێکی قورئانی بۆ دانراوەو گرنگترینیان:

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ




السبيل إن كنتم آمنتم بالله وما أنزلنا على عبدنا يوم الفرقان يوم التقى الجمعان والله على كل شيء قدير/ سورة الانفال-٤١﴾ لەو تێکستە قورئانییە پیرۆزەدا چۆنیەتی بەشکردنی دەسکەوتەکان لەنێوان خواو پێغەمبەرو سەرجەم جەنگاوەرە موسڵمانەکان روونکراوەتەوە.

ئەو کاتیش ڕێسای دابەشکردنی دەسکەوتەکان لەسەر ڕێساکانی کوشتار دروست بوو کە ئەو کات باوبوو، بەجۆرێك دەبوایە کوشتار خۆبەخت کردن بوایەو هەموو ئامادەکاریەکی جەنگیش لەلایەن جەنگاوەران خۆیان بوایە. بەڵام لەسەردەمی ئێستاماندا ڕێساکانی کوشتار بەشێوەیەکی نوێ دەرچووەو ڕێساکانی کۆن وایان لێ هاتووە زەرەرمەند بن، ئێستا جەنگاوەران لەسەریانە بەپێی فەرمانی دەوڵەت خزمەتی نیشتمانیان بەجێ بگەیەنن نەوەك خۆبەخت کەرین. هەروەها ڕێکخستن و ئامادەکردنی کوشتار بەچەك و تەقەمەنی سەربازی لەلایەن دەوڵەتەوەیە نەوەك سەربازان، چونکە تاکە کەس بەتەنیا ناتوانێ فرۆکە، چەکی قورس و مووشەك پەیدا بکات.

ئەمرۆ بەرژەوەندییەکە لەوەدایە بەنوێخوازی بیر بکەینەوە، ئەگەرنا سوپاو نیشتمان و ئیسلامیش دەفەوتێ، بەو واتایەش نا کە کار بەقورئانی پیرۆز نەکرێ‌و بڵێین ئەو سورەتی ئەنفالە باوی نەماوە، بەڵکو ئەوە بۆ زەمانێك بوو بەر لەئێستا، ئەگەر نا پیرۆزی‌و مەزنی ئایەتەکە هەر ماوەو دەمێنێ.

نوێخوازی هەر بۆ مەسەلەی دەسکەوتی شەڕو کاروباری جەنگی دانەنراوە، بەڵکو مەسەلەی کۆیلایەتیش (الرقیق- العبید) بابەتێك بوو قورئانی پیرۆز مرۆڤی لێ رزگار کردو ئیدی سەردەمی کۆیلایەتی نەهێشت و خەڵك هەرکەسە بەسەربەستی دەژیێ.

## * رەهەندەکانی بیری مرۆڤ

مەرج نییە هەر نوێخوازییەك ئەمرۆ ئایەتێك بوەستێنێ‌و بڵێین -بۆ ئەو زەمان وتراوە- بەڵکو لەئەمرۆدا لەزۆر بابەتدا زیاتر پێویستیمان بەتێگەیشتنی ئایەتەکانی قورئان هەیەو کەلکی لێ وەردەگرین. دەبینین پێشکەوتنی زانست و راهێنانی تەکنەلۆژی وایان لەمرۆڤ کردووە دەسەلآت بەسەر سروشتدا بگێڕێ‌و، بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی داهاتە سروشتییەکان بۆ مرۆڤ بەرهەم بێنێ‌و لەخزمەتی مرۆڤدا بەکاریان بێنێ، بۆ ئەوەش نمونەیەك دەهێنمەوە کە خوای گەورە دەربارەی دروست بوونی دەریا دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ/ سورة النحل-١٤﴾ مرۆڤی ئەو سەردەمە زیاتر لەمانای ئەو ئایەتە دەگەن نەوەك مرۆڤی پێشوو، هەر بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاشەوە مرۆڤی سەردەم زیاتر کەڵك لەدەریا وەردەگرن وەکو دۆزینەوەی نوێترین و باشترین جۆری دەرمان لەگۆشتی دەریاو، دروستکردنی جوانترین و نوێترین کەل و پەلی جوانکاری‌و بەکارهێنانی نوێترین جۆری پاپۆر لەنێو دەریادا بۆ گواستنەوەی خەڵك و شتومەك و کاری جەنگی‌و لێکۆڵینەوەی دەریاوانی.

لەکۆتاییدا دەمەوێ بڵێم ئیسلام ئەو ئایینە پیرۆزەیە کە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووەو، سەرچاوەکەشی خوای گەورە دایهێناوە، پێغەمبەریش(د.خ) ئەو پەیامە پیرۆزەی ئیسلامی بەخەڵك راگەیاندووەو لایەنەکانی بۆ شی کردوینەتەوەو بانگی برواهێنان بەقورئانی کردووەو لەژیانی خەڵکدا رەنگ بداتەوە.

هەروەکو ئایین شتێکی خواییە، بۆیە خەڵکیش لەسەریانە بەدەنگییەوە بچن و بێ سلەمینەوە ئەو ئایینە بپەرستن، بەڵام کەلتوری ئیسلامی چەند رەنگ و لایەنێکی رۆشەنبیرییە کە لەدێر زەمانەوە بۆمان ماوەتەوەو ئەو کەلتورەش رەنگە لەگەڵ ئیسلام بگونجێ یاخود جیاوازی هەبێ.

کەلتوری ئیسلامی داهێنانێکی مرۆڤانەیە، هەربۆیە شتێکی پیرۆز نییەو، پابەند بوونیش پێی ئایینی نییە، بەڵکو پابەندبونێکە ئەدەبییەو دەتوانین وەکو پاشماوەیەکی کۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین و لەژیاندا بەپێی پێویست و ئارەزووی سەردەم بەکاری بێنین.




# ڕەوتی زانستی نوێ لەبەرژەوەندی ئیسلام دایە

و/ی. پزیشك/ قاسم عەزیز

سەرەڕای ئەوەی قورئانی پیرۆز بنەمایەکی سەرەکییە بۆ بنیاتنان و چەسپاندنی بیروباوەڕو حوکمە شەرعییەکان و هیدایەت و ڕێنمایی لەگەڵ دابەزینی گۆڕانکارییێکی بنەڕەتی بەسەر کۆمەڵگادا هێنا کە (خەڵکی لەشیرك و هاوبەشی گواستەوە بۆ یەکتاپەرستی، لەگومڕایی بۆ هیدایەت، لەخراپەکاریو ئینحرافەوە بۆ چاکسازی) لەگەڵ هەموو ئەمانەش قورئانی پیرۆز خۆی لەخۆیدا شۆڕشێکی بەهێزی زانستی بەرپا کرد لەگشت بوارەکانی ژیاندا، بەتێرامان و وردبوونەوە لەقورئانی پیرۆز دەبینین زیاتر لە(١٢٠٠) ئایەتدا ئاماژە بۆ چەندین راستیو حەقائیقی زانستی کراوە، بەپێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا موعجیزەکانی قورئان زیاتر دەردەکەون، واتە بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی ناحەزان، ئیمڕۆ ڕەوتی زانستی پالپشتێکی بەهێزی قورئانی پیرۆزو ئایینی پاکی ئیسلامە، ئاراستەی زانستی ئیمڕۆ پێچەوانەی دوێنێ دەڕوا، دوێنێ زانست لەخزمەتی فەلسەفەی مادیەت بوو بەلام ئەمڕۆ ڕەوتی زانستی گۆڕدرا بەهۆی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا لەگشت بوارەکاندا.

هۆی سەرەکی ئەم گۆڕینەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێشتر زاناکان بیروبۆچوونیان سەبارەت بەگەردوون وابوو کە گەردوون هەر هەبووەو هەر دەشمێنێو سنووریشی نییە، ئەمەش یاسایەك بوو پێیان دەوت (گەردوونی وەستاو) کە ئەمە تەواو پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بووە، بەلام دوایی راستییەکان دەرکەوتن و ئەم یاسایە شکستی خواردو یاسای (گەردوونی فراوان بوو) هاتەکایەوە، بەپێی ئەم یاسایە گەردوون سەرەتای هەیەو کۆتایشی هەیە، کە ئەمەش دەقاو دەق لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز یەکدەگرێتەوە.

لەبورای کۆرپەلە زانیشەوە لەقورئانداو هەم لەفەرمایشتەکاندا زۆر ئاماژەی پێکراوە، زۆر راستی هەن لەم بوارەدا زانستی نوێ ئیمڕۆ پێی گەیشتووە، کەچی قورئانی پیرۆز چەندین سەدە بەر لەئێستا ئاشکرای کردوە. خوای جوانکار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ طِينٍ* ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ* ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ/ سورة المؤمنون/ ١٢-١٤﴾ لەم چەند ئایەتەدا قۆناغەکانی کۆرپەلە دیارکراوە کە بەچەند قۆناغ تێپەڕ دەبێت، وەك ئەمەی خوارەوە:

١.نوتفە ٢. پارچە خوێن ٣. پارچەی بچووکی گۆشت ٤. ئێسك ٥. پارچە گۆشت ٦. دروست بوونی کۆرپەلە.

کۆنگرەی پێنجەمی ئیعجازی زانستی لەقورئان و سوننەتدا کە لەئەیلولی ١٩٩٥ لەمۆسکۆ سازدرا تێیدا راگەیاندرا کە ئەم دیاری کردنەی کە قورئانی




پـیرۆز بـۆ قۆناغـەکانی کۆرپەلـە دیـاری کـردووە، بـەپێی لێکۆڵینـەوە زانسـتییەکان هـەمووی راسـت دەرچوون، هـەر لەکۆنگرەکـەدا بڕیاریـاندا کـە وەك بنەمایـەکی سـەرەکی ئـەم زانسـتە پشـتی پـێ ببەسترێ، هەروەها (د.کیث مۆر Keth More) کـە یەکێکە لە بەناوبانگترین زانایانی کۆرپەلـە زانـیو سـەرۆکی بەشـی ئـەم زانسـتەیە لـەزانکۆی تورنتـو لەکەنـەدا کتێبێکـی نووسـی لـەبارەی کۆرپەلـە زانـی سـەرچاوەی سـەرەکی کتێبەکـەی قورئـانی پیرۆز بوو. هەروەها (د.کیپ مۆر) لەسـالی ١٩٨٦ لـەقاهیرە سیمینارێکی لـە بـارەی زانسـتی ناوبراو سازدا تێیدا وتی: ((مـن شـایەتی بەراسـتی ئایەتـەکانی قورئـان دەدەم لـەبارەی کۆرپەلـەزانی، بۆچوونیشم وایـە نـە محەممـەد(د.خ) نـەهیچ کەسـێکی تـر دەتوانێـت قۆناغەکانی کۆرپەلە بزانێ ئەگەر ﴿**وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى/ سورة النجم/ ٣-٤**﴾ راست نەبێ، هەروەها هـەموو ئەوانـەی لـەقورئانی پـیرۆزدا خوێندومەتەوە دەقاو دەق لەگەڵ زانسـتی ئیمـڕۆ یـەك دەگرێتـەوە سەرەڕای ئەو ماوە زۆرەی نێوانیان)).

جێگای وەبیر هێنانەوەیە ژمارەی ئەو ئایەتانەی کە باسی کۆرپەلـەزانی دەکەن دەگاتـە (٤٠) ئایـەت بەسـەر (٢٨) سـورەتدا دابەشـکراون، هـەر بـۆ زانینیش مـاوەی دروسـت بوونـی و گەشـەکردنی کۆرپەلـەش پێویسـتی بـە (٤٠) هەفتـە هەیـە واتـە (٢٨٠) رۆژ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە زاناکانی کۆرپەلـەزانی پێشـتر بۆچوونیـان وابـوو کـەمنداڵ لەهێلکـەی ئـافرەت پێکدێـت ئینجـا دەچێتـە منداڵدان و گەشە دەکات ئەمە رای (د.گراف) بوو، بـەڵام زانایـەکیتر بـەناوی (Sumerdam) بۆچوونـی وابوو کە منداڵ لەئاوی پیاو دروست دەبێت، بەڵام قورئانی پیرۆز پێش ئەوان بەر لە (١٤) سـەدە چۆنیـەتی دروسـت بوونـی کۆرپەلـە بـەیان دەکـات، وەك لـە ئایـەتی ٢ی سـورەتی (الانسان)دا هاتووە: ﴿**إِنَّا خَلَقْنَا الإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ/ سورة الانسان/٢**﴾ نوتفە وشەیەکی تاکە بـەمانای وشـەی (امشـاج) واتـە تێکەڵـە- (مزیـج)ی ئـاوی ئافرەت و ئاوی پیاو کە هێلکەی پیتێندراو پێکدەهێنێـت، کـەچی زانسـتی نوێ تازە بـەم راسـتییە گەیشـتووە، هـەروەها بـەپێی لێکۆڵینـەوە پزیشـکییە نوێیـەکان بـەم دواییـە سـەلمێندرا کـە سـەرجەم جومگـەکانی لەشـی مـرۆڤ (٣٦٠) جومگەیـە (Joints) بـەڵام پێغەمبـەر(د.خ) (١٤) سـەدە بەر لەئێسـتا وەك پسـپۆڕێك لـەم بارەیـەوە فەرموویـەتی: [**في الانسان ستون وثلاثمائة مفصل فعليه ان يتصدق عن كل مفصل صدقة**] ئایا کێ محەممـەدی(د.خ) نـەخوێندەواری فـێری ئـەم وردەکارییەی لەشی مرۆڤ کردووە؟ ﴿**وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى/سورة النجم ٣-٤**﴾

سەرچاوە: /مجلة الفتح/ حوزيران ٢٠٠١.

**بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی ناحەزان، ئیمرۆ رەوتی زانستی پاڵپشتێکی بەهێزی قورئانی پیرۆزو ئایینی پاکی ئیسلامە**

**بە پێی لێکۆڵینەوە پزیشکییە نوێیەکان بەم دواییە سەلمێندرا کە سەرجەم جومگەکانی لەشی مرۆڤ (٣٦٠) جومگەیە بەڵام پێغەمبەر(د.خ) (١٤) سەدە بەر لەئێستا فەرموویەتی: [في الانسان ستون وثلاثمائة مفصل فعليه ان يتصدق عن كل مفصل صدقة]**





# گەلی کورد لەروانگەی زانایانیەوە




قاسم بەرزنجی

میللەتی کورد لەدوای ئەوەی بەئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاشنا بوو و خۆی لەنێو بازنەی ئەم ئایینە مەزنەدا دۆزییەوە، زاناو شارەزاو بلیمەتی گەورەی لەو رێگەیە لێ هەڵکەوت و خزمەتی بێ سنوورو لەبن نەهاتوویان بەبەرنامەی ژیانی خۆیان هەڵبژاردووە، کەهەتا رۆژی دوایی ئیسلام و کورد شانازییان پێوەبکات. ئەمەش رەوشتێکی دێرین و کالآی بالآی کوردە، کە هەمیشە لە هەمبەر مەسەلەو بابەت و بوارێک زۆر بەجدیو دڵسۆزی و قوڵ و زیرەکی ئامێزی کردۆتەوەو قوربانی پێشکەش دەکات، سەرقافلەیی بۆخۆی وەدەست دێنێ و زۆربەی کاتیش گرەوەکەی بردۆتەوە. لاپەرەکانی مێژووش گەواهی ئەوە دەدەن و لێرەشدا بەپێویستی نازانم ئەو ناوانە ریز بکەم. دەشتوانم بڵێم ئەوان هەر سوارچاکی قەڵەم و نووسین نەبوون، بەڵکو هەردەم گیان لەسەر دەست و لەخۆبردوو و پێشەواو چاوساغ و خەمخۆری نەتەوەکەشیان بوون، کەلێن و بۆشاییەکیان بینیبێت و دەرۆستی هاتبن خۆیان لەقەرەی داوەو سستی و کەم تەرخەمیان نەنواندووە. بڕوانە شۆڕش وراپەڕینەکان، قوربانییەکان، دەستەی کارا زانایانی ئایینی بوون، لە جۆشدان و وشیارکردنەوەو لەخەو راپەڕاندن و رەتکردنەوەی ستەم و زۆریو ژێر دەستی، پێیان گوتوون: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (سورة البقرة/ ١٩٤) ئەوەتا (شێخ سەعید و قازی محەممەد) بێ دوو دڵیو سڵەمینەوە گەردەنی خۆیان دەخەنە نێو تەوقی پەتی خنکاندن و سێدارەوە، ئەوە پشوو درێژی و سەبرو ئارامی بارزانی نەمر بۆتە کولتوورێک پەندو دەرسمان فێردەکات. ئەم توێژە ئەوەندە بەرهەست و دووربین و واقیعبین و هەموو شت بین بوون بەر لە هەر چین و توێژێکی دیکە دەرکیان بەبابەت و ورترین شتی دەوروبەرو نەتەوەیەکەیان کردووەو لەئاستی مەسەلەکاندا بوون و وەلآمێک بوون بۆ سەردەمەکەی خۆیان و دابین کردنی دوارۆژی نەتەوەکەشیان بەوەی هەر کارو کردەوەو




خزمەتەکانیان لەبواری ئایینی‌و قورئان و حوجرەو مزگەوتدا بەرتەسک نەکردۆتەوە، لەژێر سایەی قورئان و فەرموودەو شەرعدا پەنجەیان بۆ زۆر لایەن و بابەت و بوار درێژکردووەو بە بەشێك لە ئەرك و كاری خۆیان زانیوە، بەئیمان و باوەڕەوە شەویان داوەتە پاڵ رۆژ لەبەر تیشکی کزی قوتیلەو چرا لێبڕاوانە داهێنان و كاری مەزنیان ئەنجامداوە ئەحمەدی خانی‌و مەلای جەزیری‌و شەرەفخانی بەدلیسی‌و مەلا مەحمودی بایەزیدی‌و نالی‌و مەحوی‌و عەلائەدینی سەجادی‌و مەلا جەمیل رۆژ بەیانی‌و مام هەژارو...هتد نموونەی زەق و بەرچاوی بوارو بابەتەکانن لەو دەلیڤەوە دەمەوێ بچمەسەر ئەوەی كە باس لەمامۆستایەکی مەزن و زانایەکی پڕتوێشوو و ناوەرۆك بەسەلیقەو توانا بکەم ئەویش مامۆستا مەلا عەبدولا فەرهادییە، كە ئەم زاتە لەم ماوەیە كتێبێكی بەزمانی عەرەبی بەناوی (الأكليل في محاسن اربيل) لە(٤٤٥) لاپەڕەدا بەچاپ گەیاندووەو لەوێوە چەند سەرە قەڵەمێك لەبارەی مامۆستاوە دەخەینە پێش چاوتان كە ئەمە بەشێكی زۆر كەم و ناشیاوبێت لەئاست لێهاتووی‌و زانایی‌و كارە



بەرفراوانەکانی لەبەرامبەر ئەم هەموو خزمەتەی ئەو ئەرك و خزمەتێكی زۆر بەستەبالاً بەجێبگەیەنین. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین كە ئەو بنەماڵە لەهەولێر بوونەتە كۆلەگەیەكی پتەوی ئایینی‌و خێزانێكی رۆشنبیرو ناودار، باوكێك جگە لە مامۆستا چوار كوڕی دیكەی زاناو پیاوی ئایینی بن (محەممەد فەرهادی ١٨٨٩-١٩٥٠، مەلا سادق ١٨٩٧-١٩٧٩، مەلا سەعید، مەلا ئیبراهیم ١٩١٣-١٩٨٠) ئەمڕۆش لەهەولێر لەبوارە رۆشنبیری‌و پێگە كۆمەلآتی‌و لایەنی دیكە بنەماڵەی فەرهادی شوێنی دیارو بەرچاویان هەیە. مامۆستا لەم كتێبەدا بەراستی شەونخوونی كێشاوەو ماندووبوونی دیووەو دڵسۆزی خۆی بەشارە خۆشەویستەكەی نیشانداوە دەیەوێ سەرجەلەو ناونیشان و كاروكردەوەی پیاوانی ئایینی هەولێریش شون بزر نەبێ كە ژمارەیان لەناوەرۆكی كتێبەكەدا (٤٦٧) زانایەو لەوانەیە ئەگەر زۆربەشیان نەبێت هەندێكیان لەلایەن خوێنەرانەوە هەر نەبیستراین. لەیەزدان دەپارێینەوە خوا دەست بەتەمەنی ئەم مامۆستا بەرزە بگرێ بۆ نووسینی بەرهەمی زیاتر لە بواری شەریعەت و مێژوو و ئەدەب و... هتد.




# کورد و ئایەتی
# ﴿ قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنْ الأَعْرَابِ ﴾

مەلا عومەر مەزلوم

مەبەستی سەرەکی ئێمە لەناوەرۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوە نییە کە هەڵس و کەوت و چۆنیەتی برا (عەرەبە دەشتەکییە رەشماڵ) نشینەکانی دەوروبەری (مەدینە)ی پیرۆز کە چەند تیرەیەك بوون وەکو (بنی بەکرو، موزینەو جهینە)و چەندانی تر هەڵسەنگێنین، بەڵام لەبەر ئەوەی (ئایەتە) پیرۆزەکە هەندێ پەیوەندیدارە بەخودی ئەوانەوە لەچەند لایەکەوە، بۆیە پێویستیمان بەروونکردنەوەی مەسەلەکە هەیە. ئەوە بوو لەمانگی (ذي القعدة)ی ساڵی حەوتی کۆچی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) ویستی بەخۆیو یارو یاوەرەکانییەوە، بەنیازی (عەمرە) هێنانەوە سەردانی شاری (مەککە) بکات و بانگهێشتی (عەرەبە) دەشتەکییەکانی دەوروبەری مەدینەی کرد، بەڵام ئەوان بەدەنگییەوە نەچوون، گوێڕایەڵی فەرمانەکە نەبوون، بۆیە ئەم ئایەتە هێندێ لەپلەی ئەوانی هێنایە خوارەوە. چونکە ئەوان بەخەیاڵی خۆیان وای بۆ چووبوون، کەوا موسڵمانەکان بەگژ (موشریکە)کانی قورەیشی دەچن، ئیتر سەرکەوتوو نابن و گشتیان لەنێو دەچن، هەمان ترس بوو وای لێیانکرد کە سەرپێچی لەچوونەکە بکەن. بەڵام مەسەلەکە بەم شێوە نەبوو، بەڵکو ئەو تەنگ و چەڵەمەیەی ئەو کات لەئارادابوو لەنێوان موسڵمانەکان و خەڵکی (مەککە) لەرێگەی وتووێژەوە لەگوندی (حودەیبییە)ی نزیك لەشاری ناوبراو چارەسەرکراو کۆتایی پێهێنراو موسڵمانان بەسەر بەرزییەوە بەرەو شاری (مەدینە) گەڕانەوە، لەکاتی گەڕانەوەدا سورەتی (فتح) هاتە خوارەوە، هەر لەهەمان سەفەردا هەروەکو لەمەوبەر باسم کرد مەبەستمان لەتەفسیرو شیکردنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە مەسەلەی سەرپێچی کردنی (عەرەبە) دەشتەییەکان نییە، بەڵکو مەبەستی راستەقینەمان توێژینەوەی مێژووییە لەم ئایەتە بەرامبەر بەناوبردنی نەتەوەی (کورد)و هیچی تر. کەوا بۆمان بەدەردەکەوێ کە رۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە هەرگیزاو هەرگیز سەریان دانەنواندووە بۆ دوژمنان و ناحەزان لەهیچ کات و سات و سەردەم و جێگاو بارودۆخێکەوە. بەڵکو هەر بەمەردیو نەبەردیو سەربڵندیو رووی سپییەوە ماونەتەوە، (نەتەوە)و شەرەف و کەرامەت و خاك و ئاسمانی خۆیان پاراستووە، بەرگریان لەمافی

رەوای خۆیان کردووەو بەهەزاران قوربانیان لەپێناوی داوەو لەم بوارەوە نکۆڵیان نەکردووە.

بێگومان دوو بەڵێنی ئێجگار گرنگ لەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (الفتح) زۆر بەروونی تیشك دەدەنەوە:

١) بەڵێندان بە(موژدە) واتا بۆ پێغەمبەرو یارو یاوەرەکانی کە لە(پەیمانی حودەیبییە) کە لەگەڵیدا بوون ئەویش بەکەل و پەل و خەراجی زۆر کە بەم زوانە بەبێ گرفت و کوشتن و ماندوو بوون بە چنگیان دەکەوێت.

٢) بەڵێنی ترس و تۆقاندن بۆ عەرەبە رەشماڵ نشینەکانی دەوروبەری (مەدینە)ی پیرۆز بەهۆی سەرپێچی کردنیان و بەشدار نەبوونیان لەپەیمانی (حودەیبییە).

أ- فەرموودەی (موژدە) پێدراوەکە کە ئەمە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَعَدَكُمْ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ / سورة الفتح-٢٠**﴾ واتە: خوا بەڵێنیان پێدەدات کەوا بەم زووانە دەسکەوتێکی زۆرو نایابتان لەپارەو پول و کەل و پەل و خەراج، بەبێ ماندووبوون چنگ دەکەوێت.

ب- بەڵێن بەترس و تۆقاندن بۆ عەرەبەکانی دەشت نشینی دەوروبەری مەدینەش ﴿**قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ/ سورة الفتح-١٦**﴾ خوا دەفەرموێ ئەی خۆشەویست بەعەرەبە دەشتەکییە خۆگلدراوەکان بڵێ ئێوە لەداهاتوودا بانگهێشت دەکرێن بۆ جەنگێك کە گەورەترین جەنگە، ئەویش بەگژ داچوونەوەتانە بەرامبەر بەخەڵکانێك و (نەتەوە)یەك کە زۆر ئازاو چاونەترس و نەبەزن، شارەزایی‌و دەستێکی کارامەیان لەهونەری کوشت و کوشتارو جەنگەوە هەیەو وشەی ترسان بەسەر دڵیان دانایەت. ئەگەر بێت و لەگەڵیان بجەنگن، ئەوە زیانێکی فرە زۆرتان لێدەکەوێت یان ئەوەتا کاتێ -میللەتە- جەنگاوەرەکە، بانگەوازی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان پێگەیشت ئیتر بەدڵسۆزی‌و ئارەزوو بێ ترسان لەئێوەو جەنگ باوەشی خۆیان بۆ ئایینی پیرۆز دەکەنەوەو لەگەڵتاندا ناجەنگن، تۆ بڵێی کام میللەت بێ وا خوای گەورە لەژووری حەوت ئاسمانەوە، بەم جۆرە مەدحیان دەکات و عەرەبە دەشتەکییەکان پێ دەترسێنێ. ئێمەش لەوەلاًمدا دەڵێین (کوردە)کانن.

هەروەکو بەم بەڵگانەی خوارەوە سەلمێندراوە، کە مەبەستمان فەرمایشتی خوای گەورەیە لە ﴿**سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ/ سورة الفتح-١٦**﴾ کە بێگومان ئەو میللەتەی ناوی لەم ئایەتە پیرۆزە بەشێوەی ژێر پەردەوە هاتووە گەلی (کورد)ە.

بەڵگەی یەکەم {**قال: ابن ابي عمر عن ابي هريرة (ر.ض) قال: هم البارزون**} ئەم زاتە دەفەرموێ (ابوهریرە) دەبێژێت ئەم میللەتە زیرەکە (بارین)کانن واتە کوردەکانن.

بەڵگەی دووەم {**وقال: ابن ابي عمر في مكان آخر حدثنا ابن ابي خالد عن ابيه قال: نزل علينا ابو هريرة ففسر قول رسول الله(ص) (تقاتلون قوماً نعالهم الشعر) قال هم بارزون يعني (الاكراد) وقوله تعالى ﴿أَوْ يُسْلِمُونَ﴾ فيدخلون في دينكم بلاقتال بل باختيار**}.

واتە باوکی خالد وتویەتی جارێکیان (ابوهریرە) میوانی ئێمە بوو کە فەرمووی پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ {**تقاتلون قوماً نعالهم الشعر**} مانای وایە لەگەڵ میللەتێك بەگژیەکدا دەچن کە پێڵاوەکانیان بە(موو) چنراوە،




واتە (کەوشـە)کانیـان مواویـن و لـەمووی (مـەرەز) دروسـتکراون، جـا ئـەم پێـڵاوە مودارانـە (بـاریزە)کـانن بـەمانای (کوردە)کانن. لە تەفسیری وشەی ﴿أَوْ يُسْلِمُونَ﴾ لەئایەتـە پیرۆزەکـەدا هـاتووە، یـان میللەتەکە، موسڵمان دەبێت و دێتە سەر ئایینی پیرۆزی ئێوە. بەڵام بەئارەزوو و خواستی خۆیان نەك لەترسـی جـەنگ یـان لەترسـی ئێوە. تەفسیری {(القران العظيم) للشيخ الفداء اسماعيل بن كثير: سورة الفتح اية ١٦ ص ١٩٠ ج٥}.

بێگومـان لەسـەردەمی خەلافـەتی (عومـەری کـوڕی خـەتاب) خـوا لێـی رازی بێـت کاتێ لەشکری هـاوەڵ و یـارانی پێغەمبەر(د.خ) گەیشتنە هەرێمی کوردستان گەلی کورد بەبێ شەڕو دوودڵی قەبوڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کـردو هـەتا ئێسـتاش لەگەڵدابێت هیچ سـەرچاوەیەکی بـاوەڕپێکراوی راسـتەقینە نییـە لەسەر ئەوەی کەوا بیسەلمێنێت کـەوا کوردەکـان لەگـەڵ یـارانی پێغەمبـەر(د.خ) کەوتبنـە جەنگەوە مەگەر بە (شان) ئەویش لـەوتارە بەناوبانگەکـەی ئیمـامی عومـەرو رۆژی هـەینیو لەمەدینـەی پـیرۆز، کـە لەسـەر (مینبـەر)و لـەنێو وتارەکـەیدا فـەرمووی (یـا سـاریە الجبـل، الجبل).

لـەکاتێکدا سـاریە کـە یـەکێك بـوو لەسـەرکردەکانی یـارانی پێغەمبـەرو لـەکێوی (نـەهاوەند) لەگـەڵ بێباوەڕەکـاندا لەهـەمان کێـو لەجـەنگدا بـوون. کـەوا خـەریك بوون بـێ بـاوەڕان لـەلای کێوەکـەوە پشـتیان لێ بسـتێنن، لەناو وتاری هەینییەوە عومەری کـوڕی خـەتاب ئاگـاداری سـەحابەکانی کـردەوە لـەفرت و فێڵـی بـێ بـاوەڕان، بـەڵام کـێ دەڵێت ئەم بێ باوەڕانەش کورد بوونە، بەڵکو لەوانەیە فارس یان تۆرانی بوونەو، کێ ناڵێت ئەگەر بهاتایە کوردەکان لەگەڵ یارانی پێغەمبەر(د.خ) شەڕیان بکردایە ئێسـتاش کوردسـتان هـەروەکو پێشان نەدەمایـەوە، هـەر لـەنێو شـەوی جـەهل و نـەزانیدا نەدەتلایەوە. لەلایەکی تریشـەوە مادام میللـەتێك هێنـدە زیـرەك و نەبەز بێـت هـەرگیز هیـچ گـەل و لەشکرێك ناتوانێت بەربـەرەکانی بکـات و بەسـووك و ئاسـانی لەبەرامبەریدا بوەستێ بەتایبەت کە شوێنەکەی هێندە سـەخت و نەستەم بێت لەلایەن شاخ و داخ و کۆرە شیوو جەنگەڵەوە ئەمە لەلایـەك، لەلایـەکی تریشـەوە، کـەوا یـارانی پێغەمبـەر(د.خ) شوێنەکەیان دەشت و بیابانێکی کاکی بەکاکییەو هەرگیز تووشی شـەڕێ نەهاتوونـە لەشـوێنی ئـا بەم شێوە عاسی بێ ئەمەشـیان

**بێگومان لەسەردەمی خەلافەتی (عومەری کوڕی خەتاب) خوا لێی رازی بێت کاتێ لەشکری هاوەڵ و یارانی پێغەمبەر(د.خ) گەیشتنە هەرێمی کوردستان گەلی کورد بەبێ شەڕو دوودڵی قەبوڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردو هەتا ئێستاش لەگەڵدابێت هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی راستەقینە نییە لەسەر ئەوەی کەوا بیسەلمێنێت کەوا کوردەکان لەگەڵ یارانی پێغەمبەر(د.خ) کەوتبنە جەنگەوە**




لەلایەنی یاسای سەربازییەوە، واتا زۆر ئاسان نییە، کە لەشکرو سوپایەك هەر لەشەڕی دەشت ڕاهاتبێت و ئێستا تووشی شەڕێك بێت لەگەڵ سوپایەکی مەشقکارو شارەزا بەهەموو فرو فێل و ئۆینی جۆراوجۆری جەنگیو سەربازی وەکو هەڵۆ چیا نشینەکانی گەلی کورد. ئاسان و ئاسایی نییە کە بتوانێ خۆی لەبەرامبەریدا ڕابگرێت. هەڵبەتە ئەمەشیان بەڵگەیەو پاڵسەنگە، بۆ ئەوە کەوا هەرگیز یارەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەهیچ کلۆجێك نەکەوتوونەتە جەنگی بەرامبەرەوە هەروەکو دوژمنانی (دین و دنیا)ی کورد، بۆ پروپاگەندەو ئاژاوە نانەوەو درۆ دەلەسە، باسی لێوە دەکەن.

٣) لەپەرتوکی {(التاج جامع الاصول في احاديث الرسول) شيخ منصور علي/ ج٥، ص٣٢٤}دا هاتووە{عن ابي هريرة (ر.ض) عن النبي (ص): **(لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا قوماً نعالهم الشعر)** رواه الخمسة. وفي رواية **(يلبسون الشعر ويمشون في الشعر)** اي يعملون من الشعر حبالاً ويصنعون منها الملابس والنعال}واتە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: ڕۆژی دوایی دانایەت هەتا وەکو ئێوە بەگژ میللەتێکدا نەچن، کەوا پێڵاوەکانیان (مووایین).

٤) لەریوایەتی دووهەمدا دەفەرموێ: ئەو میللەتە زیرەکەی ئێوە بەگژیاندا دەچن و بەرەنگاری دەبنەوە جل و بەرگیان لە(موو)ە واتە لەمەرەز دروستکراوە بەپێڵاوی مووایش دەڕۆن، واتە دەزووی (موو) بەکاردێنن بۆ پێداویستییەکانی خۆیان وەکو پەت و گوریس و سێتاو شتی تر. جا مەبەستی پێغەمبەر(د.خ) روون و ئاشکرایە لە (يلبسون الشعر)دا کەوا بەرگی (رانکوچۆغە)یە چونکە جگە لە کورد هیچ میللەتێك (رانکوچۆغە) لەبەرناکات و، بەکارنایەنێ، هەڵبەتە هەروەکو هەمووشمان دەزانین (رانکوچۆغە) لەمووی مەرەز دروستدەکرێت.

هەروەها بەهەمان شێوە هیچ خەڵکانێك لەسەر گۆی ئەم زەوییە نییە جگە لەگەلی کورد کەوا پێڵاوی لەمووی چنراو بکات بەپایەوە. جا ئەو پێڵاوانەی لە مووچنراون و دەچنرێن لەکوردستان بە گشتی سێ جۆرن:

١-(زەرگاو) جۆرێکیان بووە کە لەدەڤەری بادینان دروست کراوە.

٢-جۆرە پێڵاوێکە کە ئێستا لەناوچەی خۆشناوەتی باوی هەرماوەو لەپێستەی (ڕەشەولاغ)و موو دەچنرێت و ناودەبرێن بە (کالەکە گا) بەزۆری لەوەرزی زستان بەکاری دێنن.

٣-جۆرێکی تریش لەناوچەی (هەورامان)و جافایەتی دروستی دەکەن لە(پەڕۆ موو و سیرمە)ە بەکلاشی هەورامان ناودەبرێت..

٤-بێگومان هەر لەدێر زەمانەوە میللەتی کورد پەت و گوریس و سێتاو ئەم جۆرە شتانەشی هەر لەمووی (مەرەز) دەیانچنێت و چنیویەتیو لەکاروباری ناومالی بەکاری هێناون.

٥) موژدەیەکی تر لەهەمووی خۆشترە جێگای فەخرو شانازی گەلەکەمانە ئەویش {**(وعنه عن النبي(ص) قال: هل سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب في البحر) قالوا: نعم يا رسول الله قال: لاتقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفاً من بني اسحاق**} لەشیکردنەوەکەیدا دەڵێت: {**من اکراد الشام المسلمين**} (ابو هريره) لەپێغەمبەرەوە(د.خ) دەفەرموێت بەیارەکانی ئایا ئێوە گوێبیستی شارێك بووینە کەوا لایەکی کەوتۆتە وشکانیەوەو لایەکەی تری کەوتۆتە دەریاوە؟ وتیان بەڵێ بیستومانە ئەی پێغەمبەری خوا، جا فەرموی ڕۆژی دوای دانایەت هەتا وەکو کوڕەکانی ئیسحاق ئازادی نەکەن، کە ئەو کات ژمارەیان دەگاتە حەفتا هەزار سەرباز لەهەمان سەرچاوەکەداو لە شەرحەکەیدا دەڵێت: مەبەست لەکوڕەکانی





ئیسحاق (کوردە موسڵمانەکانی سوریەن) مژدەکەشی ئەمەیانە کەوا پێغەمبەر ناوی نەتەوەی کوردی بردووە بەکورەکانی ئیسحاق پێغەمبەر کوری حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل (علی نبینا وعلیهم الصلاه والسلام) کە بەباوکی پێغەمبەران بەناوبانگە.

کە بەم شێوەیەو لەسەر زمانی پێغەمبەر (د.خ) کە ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنْ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى/ سورة النجم-٣-٤﴾ دەستنیشانی (رەسەنی) راستەقینەی گەلی کورد کراوە. کەواتە رزگاریمان بوو لەناوو نازناو و، رەسەنە دەستکردەکانی نووسەرو مێژوونووسە بێگانەکان، کەوا هەریەکەو بەجۆرێك و شێوەیەك (زار) لەسەر مێرن (رەمل)ی خەیاڵی خۆیانەوە بۆمان هەڵدەدەن. هەندێ دەڵێن کورد (گوتییە)و لەرەسەنی گوتییەکانە، هەندێ دەڵێن (کاردۆخیە) هەندێ دەڵێن (خالدیە) یان (کاردە)و (المسعودی) دەڵێت کورد لە نەتەوەی (دێوی) حەزرەتی (سلێمانە) یان (قال مجاهد تلوت هذة الاية ﴿حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ/ سورة الانبياء-٦٨﴾ علی عبدالله بن عمر فقال: اتدري یامجاهد من الذي اشارة بتحریق ابراهیم بالنار؟ قلت لا، قال رجل من الاعراب فارس قلت وهل للفرس اعراب؟ قال: نعم الكرد هم اعراب فارس) واتە (مجاهد) دەڵێت کاتێ پرسیاری مانای ئەم ئایەتەم کرد لە (عبداللە) لەوەڵامدا پێی وتم ئایا دەزانی کێ بوو ئیشارەتی کرد بۆ سوتاندنی (ابراهیم) بەئاگر؟! لەوەڵامدا وتم نازانم، وتی پیاوێ بوو لەدەشتەکییە رەشماڵ نشینەکانی فارس. وتم بۆچی، ئایا فارسەکانیش، کۆچەری دەشتەکیان هەیە؟ وتی بەڵێ (کوردە)کانن، بەڵام ئێمە دەڵێین هەرچەندە کورد دەشتەکی فارسەکان نییەو بەرگ و زمان و داب و نەریتی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئەمەشیان بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کەوا (کورد) لە(ابراهیم)ەو (ابراهیم) کوردە. لەبەر ئەوەی بەداخەوە زۆران لەموفەسیرەکان دان بەوە دانانێن کە ئیبراهیم کورد بوو، ئیتر هەر یەکە بەجۆرێ ناوو شوێن و رەسەنێکی دەستکردی بۆ دەستنیشان دەکەن، (بابل- اهواز- مشارق- العراق)و چەندانی تر، بەڵام وتەکەی عەبدوڵلا ئەوە دەگەیەنێ کە ئیبراهیم لەناوچەیەکی کوردەواری بووەو خەڵکەکە کوردن. چونکە ئەگەر بەم پێیە لێکی نەدەینەوە، هیچ رەوا نییە پیاوێکی کورد لێرەوە بچێتە بابل بڵێت دەی ئیبراهیم بسوتێنن. یان پیاوێکی کورد بەناوی (هینون) بۆ جاری یەکەم (مەنجەنیق)ی دروستکردبێت بۆ ئەوەی (ابراهیم) پێیەوە بخەنە ناو ئاگرەکەوە. لەم هەموو بەڵگانەو هێنان و بردنە، ئەوەمان بۆ روونەدەکاتەوە کە (ابراهیم) کوردەو شوێن و جێگەو رێگەشی کوردستان بووە.خۆم شوێنەواری ئاگرەکەم دیوەو، کە ئێستاش بەدۆڵی (ناران) بەنێوبانگەو کەوتۆتە ناوچەی (بیتوێن)ی رانیەوە.

## سەرچاوەکان


١. سورەتی (الفتح) ئایەتی ١٦، بەرگی ٥، تەفسیری- القران العظیم- للشیخ ابي اسماعیل عمر قریش الدمشقي المتوفي ٧٧٤هـ - لاپەرە ١٩.

٢. التاج الجامع للاصول في احادیث الرسول للشیخ منصور علي/ بەرگی٥ - لاپەرە ٣٢٤.

٣. تاریخ الطبری تاریخ الامم و الملوك / المتوفي ٣١٠هـ/ بەرگی١ - لاپەرە ٢٤٠.

٤. مێژووی کورد و کوردستان/ علاءالدین سجادی / بەرگی١ - لاپەرە ١٢.





# مامۆستا شێخ ڕەئوف شێخ سەعیدی نیشتمان پەروەرو ئایین پەروەر

ئا: ب.ئەوقاف سلێمانی

شێخ ڕەئوف شێخ سەعید شێخ مەعروف لەبنەماڵەیەکی ئایینی ناسراوی شاری سلێمانی لەساڵی ١٩٢٣ لەدایك بووە، لەژێر چەتری فێرکردنی ئایینی ئیسلامی پەروەردەکرا. . . لەقوتابخانەی مەولانا خالید پەروەردە دەکراو فێری ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەبوو. . . لەسەرەتای ژیانییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ فەقێو دەروێشەکانی تەکیەکەی خۆیان بووبوو لەسەرەتاوە لەسەر دەستی زۆر لەگەورە شێخەکانی شاری سلێمانیو شێخ سەعیدی باوکی دەیخوێند، لەسەرەتای خوێندنیەوە پەیوەندییەکی توندی لەگەڵ بارزانی نەمردا پەیداکردبوو کاتێ لەمزگەوتی شێخ سەلام دەیان خوێندو لەدوای تەواوکردنی دەرسەکانیشیان تاکو ئێوارە درەنگ هەر بەیەکەوە دەبوون. . . شێخ ڕەئوف کوڕی شێخ سەعید بوو کە دوو کوڕی



تریشی هەبوو شێخ عەبدوڵڵاو شێخ لەتیف کە ئێستا حاکمە.. لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا لەمەراسیمێکی شکۆداردا کە تیایدا پیاوانی ئایینیو شێخانی سلێمانیو پیاوماقوڵان ڕەزامەندیان دەربڕی لەسەر ئەوەی شێخ ڕەئوف کاروباری تەکیە بگرێتە دەست.

لەساڵی ١٩٤١ بەئیرادەی مەلیکی بەئیمام و مورشیدو مەتوەلی دامەزرا. لەبەر ئەمەش خوالێخۆشبوو شێخ بابا عەلی هەموو مەلاو ئەشرافی سلێمانی کۆکردەوەو ئاهەنگێکی گەورەی سازکرد، فەقێکانی سلێمانی بەقەسیدەو هەڵپەڕکێ ئاهەنگەکەیان گەرم کردبوو لەولاشەوە دەروێشەکان هەموو کۆببوونەوە، ئەوانیش بەزکرو تەهلیلە بەشداریان دەکرد. شێخ بابا عەلی بەزمانە پیرۆزەکەی فەرمانە مەلەکیەکەی هەروەها ئیجازە مەلایەتیەکەی خوێندەوەو داواشی لەمامۆستا مەلا حوسێن پسکەنی کرد کە جبەو مێزەرەکەی لەبەر شێخ ڕەئوف بکات.

لەسەرەتای تەمەنی لاوێتیدا لەژێر چەتری جبەو مێزەر ژیانی دەستی پێکردو دەبوایە بژێوی بنەماڵەکەی دابین بکردایەو ئەرکی تەکیەو مزگەوتیشی بەڕێوە ببردایە، دەستووری باوو باپیرانی تێك نەداو لەسەر ڕێڕەوی ئەوان بەردەوام بوو تەکیەکەو مزگەوتەکە کە هەمیشە جێگای زانایانی ئایینیو سەرچاوەی تەریقەی قادری بوو، زۆر بەرێك و پێکی بەردەوام بوو، ناوبانگی تەکیەکە ئەوەندەی تر




بلاو بووەوە، وەك نەریتێکی باو هەموو سێ شەممەو هەینیان کۆڕی زکری تێدا دەبەستراو قەسیدەی تیا دەخوێندرایەوە. تەکیەکە جێگای حەوانەوەی میوانەکان کە لەدەرەوەی شار دەهاتن بۆ سلێمانیو فەقێو لێقەوماوان و دەست کورتەکانی شاری سلێمانیبوو.. هەموو ئێوارانیش گوێ لەگرفتی خەڵك دەگیراو بەپێی توانا چارەسەری ئەو گرفتانە دەکراو چەندین گرفتی گەورەی تیادا کۆتایی هاتووە.

شێخ رەئوف بەرەسمی بوو بەسەرۆکی (لجنة تقديرات) بەفەرمانی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی گشتی ساڵێ دووجار بۆ خەملاندنی ناحیەی بازیان و هەر موڵکی هی ئەوقاف بووایە دەرۆیشت.

لەمانگی ٣/١٩٤٧ شەرەفی ئەندامیەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی پێبەخشرا.. لەم مێژووەوە تێکۆشانی خۆی دەست پێکرد. لەنەورۆزی ئەو ساڵەدا لەتووی مەلیك ئاهەنگێکی رەسمی سازکراو تیایدا شێخ رەئوف لەگەڵ هەمزە عەبدوڵلا وتارێکی تیا خوێندەوە. تەکیەکەی بوو بەجێگای کوردایەتیو تێکۆشان چەندین کۆڕو کۆبوونەوەو کاری سیاسی تێدا ئەنجام دەدرا. دوای ئاهەنگەکە شێخ رەئوف لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو کاتە دەستگیر کرا. ساڵی ١٩٦١ کە شۆڕشی دەربەندی بازیان دەستی پێکرد شێخ رەئوف لەتەخمینی بازیان بوو، هەموو ئەوانەی لەگەڵی دابوون لەبەر بەرژەوەندی خۆیان گەڕانەوە، بەڵام شێخ رەئوف لەگەڵ پۆلیسەکان مایەوە، کاتی دەستپێکردنی شەڕ کەوتە جەبهەی عارف قەرەچەتانی.. ئەو کات شێخ رەئوف لەرێکخراوی کاسبکاران کاری دەکرد. کە گەڕایەوە بۆ سلێمانی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەوکاتە جارێکی تر گیرایەوە.

ساڵی ١٩٦٢ شێخ رەئوف ئەندامی (ل.ن) سلێمانی بوو لێپرسراوی رێکخراوی قوتابیان بوو ئەوکات دەبوایە هەر ئەندام ناوچەیەك لەبەر پێویستی پەیوەندی هەبوایە لەگەڵ دائیرەیەك.. بۆیە شێخ رەئوف دائیرەی جەیش و ئەمنی گرتە ئەستۆ. لەساڵی ١٩٦٣ لە(منع تجول)ەکەی سلێمانی کە زەعیم سەدیق کردی، کەس لەو رۆژەدا هەواڵی کەسی نەدەزانی تەقەیەکی زۆر دەکراو خەڵکێکی زۆر لەناو شاری سلێمانی دەسگیر کرا کە شێخ رەئوفا یەکێك بوو لەو گیراوانە.

شێخ رەئوف سەرەڕای ناهەمواری باری خۆی، بەڵام بەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە دەبێ دڵنەوایی ئەوانەی لەگەڵیدابوون بداتەوە، بۆیە قسەی بۆ دەکردن وەك وتار بخوێنێتەوەو هانی خۆراگریو دڵنیا بوونی لەرزگار بوونیان دووپات دەکردەوە، کاتێکی ناهەمواری بەسەر دەبرد.. کاتێکیش بەربوو هەوڵێکی زۆریدا کە خواردن بگەیێنێتە ئەوانەی لەقاعەکە لەگەڵیدا بوون و ژمارەشیان (٤٨٠) کەس بوو ئەوەندی بۆی کراو لەدەستی هات خواردن بگەیێنێتە ئەو (٤٨٠) کەسە، زۆر بەو کارە دڵخۆشببوو.

مامۆستا شێخ رەئوف یەکێك بوو لەو کەسایەتیانەی کە لەساڵی ١٩٦٣ بۆ سولح چوونە خزمەت بارزانی لەماوەت وتاری ئەو کەسایەتیانەی لەبەردەم جەنابی بارزانیدا خوێندەوەو ئەو بەڕێزانەی بەشداریان کردبوو لەم سەردانەدا (شێخ مارف شێخ حەمە غەریب بەحەسەب و نەسەبی بەرزی عائیلەیو شێخ لەتیف شێخ مەحمودو عەبدولرەحمان مەلا فەرەج کە پارێزەرێکی وریاو لێهاتوو بوو و حاجی قادر جەبار کە بازرگانێکی ناودارەو شێخ رەئوف شێخ سەعید بە حەسەب و نەسەب و مێژەرو تایەفە بەناووبانگەکەی..).

شێخ رەئوف یەکێك بوو لەوانەی لەشاری بەغداد





**مامۆستا شێخ رەئوف یەكێك بوو لەو كەسایەتیانەی كە لەساڵی ١٩٦٣ بۆ سولح چوونە خزمەت بارزانی لەماوەت وتاری ئەو كەسایەتیانەی لەبەردەم جەنابی بارزانیدا خوێندەوە**

بەشداری كۆنگرەی ئیسلامی كرد دوای ئەوەی لقی چواری بەڕێز رەزامەندی دەربڕی بۆ بەشداری كردنی و نووسراوێكی ئاراستەی لقی پێنج كردبوو كە ئاگاداری بن و هاوكاری بكەن. شێخ رەئوف وتارەكەی لەناو كۆنگرەكە نەخوێندرایەوە وەیان نەیانهێشت بخوێندرێتەوە لەبەر گرنگی وتارەكەی.. رۆڵێكی یەكجار بەرچاوی هەبوو بۆ سەرنەگرتنی مەرامی كۆنگرەكە كە دژی گەلی كوردو شۆڕشەكەی بەسترابوو، ئەو مەلایانەی لەسلێمانیو هەولێر بەشداریان كرد رۆڵێكی باشیان هەبوو، هەموویان بەسەربەرزی گەڕانەوە بۆ سلێمانی.. دوای گەڕانەوەی لەبەغدا بۆ ماوەیەكی كەم (مرسومی جمهوری) دەرچوو بەفەسڵ كردنی شێخ رەئوف لەوەزیفەی لەسەر ئەو هەڵوێستەی كە دژی ئەوان لەكۆنگرەكە نواندی..

لەساڵی ١٩٦٦ رۆژی نەورۆز كە رێكەوتی جەژنی قوربان و رۆژی هەینی بوو جارێكی تر شێخ رەئوف لەگەڵ شێخ تەهای كوڕی لەلایەن عەسكەرەكانەوە لەماڵی خۆیان گیران و بەرەو (انضباط)خانە بەڕێ كران.. شێخ رەئوف گەیشتبووە پلەی لێپرسراوی ناوچە، ئەشكەنجەیەكی زۆر زۆریان داو چەندین كەس لەو كاتەدا ببوون بەشاهید لەسەریو زۆر لەسەركردەكانی كورد ئەو كاتە بەدوژمنی خۆیان و حكومەتیان دەزانیو ئەو هەموو كارانەی لەناو شار ئەنجام دەدرا خرایە ئەستۆی شێخ رەئوف و لەكاتی بەند كردنی چەندین رۆژ خواردنیان لێ قەدەغە كرد، لەو كاتەدا چەندین بەندینخانەی كرد لەوانە (سلێمانی، كەركوك، بەعقوبەو بەغداد). كاتێ ئازاد بوو بەفەرمانی م.س بەڕێز شاری بەجێهێشت و خەباتی شاخی دەست پێكردو لەدیلمان چەندین جار چووە خزمەت بارزانی نەمر..

شێخ رەئوف لەماوەت نیشتەجێ بوو لەوێش وەك نەریتی خۆی خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و پیاوانی ئایینی دەكرد.. چەندین جار بارزانی نەمر كە سەردانی ماوەتی دەكرد لەماڵی شێخ رەئوف دەمایەوە، ئەمەش لەبەر ئەو پەیوەندییەی لەكاتی خوێندنیاندا هەیانبوو و لەپاڵ ئەو هەڵوێستانەی كە هەیبوو. ئەوە وای لێكرد هەر شتێك یان گرفتێك رووی بدایە لەناوچەكە شێخ رەئوف لەلایەن مەكتەبی جەنابی بارزانییەوە تەخویل دەكرا بۆ بەشداری كردن لەچارەسەری.. شێخ رەئوف هەر بەردەوام بوو لەسەر هەڵوێستی خۆیو لەساڵی ١٩٧٤ شێخ یاسینی كوڕی لەناو شاردا دەگیرێ، كە بەشداری دەكرد لەئەنجامدانی چالاكی لەناو شاردا، حوكمی سێدارەدانی بەسەردرا، لەموسل لەسێدارەدرا. شێخ رەئوف لەبزاڤی ئازادی خوازی كورد بەهەموو هەستیو ماڵ و حاڵ و سامانی بەشداری دەكردو بێ گوێدانە ئەو شتانە، چونكە لەرێگای كوردایەتی دابوو.. هەتا دوا هەناسەیو دواساتەكانی ژیانی درێژەی بەخەباتی كوردایەتیو خزمەتكردنی رێبازی بارزانیداو لەسەر هەڵوێستی مەردانەی ئەم زاتە لقی چواری بەڕێز لەساڵی ١٩٩٧ سوپاسنامەیەكی ئاراستە كرد. لەرۆژی ٢٠٠١/٦/١٧ دوای ململانەیەكی زۆر لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە كۆچی دوایی كردو یەكێك لەئەستێرەكانی شاری سلێمانی بەرەو مەملەكەتی ئەبەدی هەڵكشا. داستانێكی پڕ لەسەروەریشی بۆ خۆی و بۆ بنەماڵەكەی تۆماركرد.



# بۆچی یادی پیاوچاکانمان دەکەینەوە

ن: شێخ فەتاح نەقشبەندی

لەزۆر لەرۆژنامەو گۆڤارەکان و کتێب و بلاوکراوەکان دەبینین یادی هەڵکەوتوان دەکرێتەوە، ئەوەش بەگوێرەی تێروانینی بیری بلاوکراوەکە دەگۆڕێت، واتا ئەو گۆڤارەی ئایینی بێت هەڵکەوتووە ئایینییەکان باس دەکات وەك ئەو گۆڤارو بلاوکراوە ئایینیانەی ئێستا لەگۆڕەپانی کوردستان هەن. لێرەدا مەبەستی من ئەوەیە بۆچی یادی ئەو هەڵکەوتووە مەزنانە بکەینەوە؟ ئایا کارێکی شیاوو پەسەندە یان کاغەز بەفیڕۆدانە؟ لێرەدا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: گرنگی ئەم یادکردنەوە لەوە دایە قورئانی پیرۆز لە سێ باس پێکهاتووە: ١. تەوحیدو بیروباوەڕ ٢. ئەحکامەکانی شەرعی ٣. رووداوو کارەساتەکانی سەردەمی پێشوو. زۆرن ئەو سەرگوزەشتانەی خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردون، وەك: نوح و لوت و ئیبراهیم و موسا.. یان وەك فیرعەون و سەمودو شەدادو عاد.. کەواتە مادام ئەوەندەمان گوت گرنگییەکە خۆی لەخۆیدا بەدیار دەکەوێت. ئێستاش هەندێك گرنگی یادکردنەوەی هەڵکەوتوان دەخەینە روو:

یەکەم: ئەوانەی یادیان دەکرێتەوە یان هەڵگری پەیامی لەخوا ترسان، یان بیرمەند، یان شاعیر و ئەدیبێکە، یان شۆڕشگێرو قارەمانێکە، واتە دەبێت ئەم مرۆڤە لەکارێکدا جۆرە پسپۆرییەکی هەبووبێت، بەمەش ئەو مرۆڤانەی دەیانەوێت هەمان رێباز بگرنەبەرو لەگەڵ هەمان کاروان بکەون بەخوێندنەوەی ژیاننامەی ئەو مرۆڤە دەتوانن ئاسانکاری بۆ خۆیان فەراهەم بکەن، چونکە ئەو کارەی ئەوانە دەیانەوێت بیگرنە بەر ئەوانی پێشوو لێشی بوونەتەوە.

دووەم: وەفادارییەکە بۆ ئەو تایبەتمەندییەی ئەوان هەیانبووە بەهۆی ناوو ناوبانگیان بۆ لەمێژوودا دەپارێزن و نایەڵن ئەو هەموو ماندووبونەی ئەوان چەشتیویانە بەفیڕۆو بەهەدەر بچێت، بەو مانایە کەسێك باسیان لێوە نەکات، بەڵکو چەند لاپەڕەیان بۆ تەرخان دەکرێت.

سێیەم: ژیاننامە تەنها ئەوەنییە تۆ ساڵ و مانگ و سەفەرو تەمەنی بوون و مردنی ئەو مرۆڤە بنووسی. بەڵکو ئەوانە هەر پێشەکییەکی کورتن بۆ ژیاننامە، بەڵکو ژیاننامەی مرۆڤێك واتا وەدیارخستنی بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانی ئەو مرۆڤە لەهەمبەر ئەو کارو کردەوانەی هاتوونەتە پێش لەو سەردەمەی ئەوی تێدابووە، پاشان لەژیاننامەکەدا بتوانێت ئەو هەموو تێڕوانینانەی شی بکەیتەوە، بەوردی بتوانیت لایەنە باش و

**تۆ ژیاننامەی مەلایەك دەنووسیتەوە، نووسینەکەی تۆ خۆی لەخۆیدا دەبێتە پارێزگاری کردن لە هەرچی مەلایە**





خراپەکانی وەدیاربێخن.

چوارەم: نووسینەوەی ژیاننامە پارێزگاریشە لەو رێبازەی ئەو مرۆڤەی تێیدا بووە بۆ نموونە کە تۆ ژیاننامەی مەلایەك دەنووسیتەوە، نووسینەکەی تۆ خۆی لەخۆیدا دەبێتە پارێزگاری کردن لە هەرچی مەلایە، چونکە بەدونیای دەسەلمێنی کە مەلا ئەوەندە گەورەن تەماشا خاوەنی فلان و فلان هەڵوێستن، یان تۆ لەژیاننامەدا ئاماژە بۆ کاری ئەوە دەکەیت بۆ نموونە باسی بیروبۆچوونەکانی مەولەوی دەکەیت دەنووسی ئەم مەولەوییە کە فلان شتانەی کردوون هەم مەلاو هەم پابەندی رێبازی سۆفیگەری بووە. ئەم پارێزگاری کردنەت واتا بزانن مەلایان و هۆگرانی ئەم رێبازە چەندە بلیمەت و خزمەتگوزار بوونە.

پێنجەم: ژیاننامەی وان پرە لەپەند بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەیخوێننەوە، نەك تەنها بۆ ئەوانەی کە لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی ئەودان.

بەکورتی نووسینەوەی ژیاننامەی مرۆڤە هەڵکەوتووەکان کارێکی زۆر زۆر پێویستە، دەبێت بەتەواوی هەوڵی تۆمارکردنی ژیاننامەی هەڵکەوتوان بدەین و ناوو نازناوو کارو کردەکانیان لەمێژوودا بنووسین بۆ نەوەکانی خۆمان بیکەینە بۆماوەو پێیان

ژیاننامەی مرۆڤێك واتا وەدیارخستنی بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانی ئەو مرۆڤە لەهەمبەر ئەو کارو کردەوانەی هاتوونەتە پێش لەو سەردەمەی ئەوی تێدابووە

هەر خوێندەوارێك بێ پێویستە بەدڵ و دەروون یادی ئەم کەڵە پیاوانە بکاتەوە بۆ ئەوەی سوودو قازانجی روحی لێ وەربگرێت

بڵێین: ئەوانە ئەم هەڵوێستەیان هەبوون دەئێوەش پەندیان لێوەربگرن. بۆیەش پێم وایە هەر خوێندەوارێك هەرچەندە بەرێکەوتیش بێ پێویستە بەدڵ و دەروون یادی ئەم کەڵە پیاوانە بکاتەوە بۆ ئەوەی سوودو قازانجی روحی لێ وەربگرێت.

چونکە خاوەن (بصیر)ەتەکان. ئەوانەی چاوو دڵیان کراوە بوو بە(رابطة)ی رووحیو پەیوەندی دڵەوە بەدۆستانی خواناس و خاوەن (عرفان) پێگەیشتوون و، توانیویانە ببن بەدۆستی راستی خوا. ئەمەشیان شتێکی (مەحال) نییە، لەبەر ئەوەی هەتا پێغەمبەری خواش (د.خ) بەر لەبوونی بە پێغەمبەرو خاوەن وەحی لەلایەن پەروەردگار بەهۆی (جبرائیل امین) ئەویش ئەم رێگەیەیەی بووە، کە پەیوەندی روحی بوو بەدڵ بیرو هۆشی دەکردەوە لەگەورەیی و بێ هاوتایی خواو دانانی کەون و کائینات. کەواتە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ بچێتە ناو ئەو بازارە هیچ مانعێك نییە ئەگەر خوا مەیلی لێ بێت شارەزای دەکات. بەڵام لەرێگەی (مورشیدێکی روحی حقیقی) زوتر پێ دەگات. بۆیە ئومێدەکەم دۆستایەتی دۆستانی خوا بکەین، بەڵکو لەبەر خاتری ئەوانیش خوای گەورە بەزەیی بەئێمەشدا بێتەوە.

وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی اله و صحبه وسلم





# گەشتا

# فەقییا

نڤسینا

ئەمین ناروزی

لەلاتینیەوە: ژیار مزیری



ئەڤ گوتارە پرانییا ژیانا فەقییان نیشان ددەت، کو چەوا ژیانا خوە بوراندینە د ناڤ حوجرا و مزگەفتادا چ دخوەند و چ دکر؟ ئەمین نارۆزی ئێکێك بۆ ژ فەقییان کو ب درێژی باسی ژیانا خوە و فەقییان دکەت ل گوتار (وان) ب تیپێت لاتینی نڤیساندییە. من ژی ب فەر دزانی ڤەگوهزم ل سەر تیپێت عەرەبی ب دەستکاری ڤە چونکی دا ئەم ژی هایداری ژیانا فەقییا ببین، کو چەوا خەلکی مە هاریکاریا فەقییان دکر بۆ تمام کرنا خوەندنا خوە، تاکو ئەوان ژی خزمەتا ئاینێ ئیسلامێ بکەن، ئەڤە ژی گروڤەیە سەر هندی کو مللەتێ کورد هەر ژ کەڤندا عەودالی ئیسلامێ بونە.

پەیڤا فەقی ژ فەقیها ئەرەبی تێ، بنگەهێ وێ ژی ژ پەیڤا فقهە ژ بو زانستیا شەریەتێ، ئانکو قانون و زاکولێ ئۆلی و جڤاکا ئیسلامێ، تێ گوتێن. فەقیە رەنگدترە و ب واتەیا شەریەتناسی یان ژی شەریەت مەدارە، لێ د ناڤ کوردان دە هاتییە سڤك کرن و بوویە ناڤ بۆ خوەندەڤانێن د ناڤ مزگەفت و هجران دخوینن.

ئەز نەشاش بم ئەم یان هەشت یان ژی نەه فەقی (شاگرت) یێن خەریب بوون و خەین ژ مە سێ سوختەیێن گوندی ژی هەبوون. د نۆر مالێ دە مرۆڤ کێم جارا ل گوندێ خوە دخوینە، پشتی چەند پەرتووکێن بچووك یێن پێشی، کو هێ یەك د وان دە سوختەتێ هسابێ، مرۆڤ دچە گوند یان باژارەکی بیانی و ل ورد دۆمینە. ژ خوە مرۆڤ ب گوندەکی تەنێ ژی نامینە بەلکی ل گوندێ جوودا جودا و هەر کو دچە ل با مەلەیێن هێ زاناتر و ناڤ دارتر دکر ە.

وەك ئادەت فەقی د سالێ دە دو جاران ل گوندان یان ژی گوندێ کو لێ دمان، مال ب مال دگەرییان. جارەك هاڤینێ، ژ بۆ زەکاتێ ل سەر بێندەران و جارا دن ژی، نەتەی جارنا، و سەرێ سالان دە ژ بۆ چڤاندنا سەرسالا خوە گوندۆ گوندۆ و مالۆ مالۆ دگەرییان. گەلەك فەقییێن مینا م.هاجی کو ب سالان نە دچوونە مال ئابوورییا وان ل سەر وی زەکات و وان دراڤێن

> ل بەرکرن و بدەنگخوەندنا ئەلفبەیێ خوەش و گەشییەکە دنە دناڤ فەقییان دە و کو ل و کەسەرا دلێ هەر فەقییێ ژێرییە




سەرسالابوون. مەرڤ ژ خوە رە ب وی هاتنێ پرتووک و کنجێ پێویست دکری. بێ ڤان هەر دویان گەرەکە دن ژی هەبوو بەس ڤێ دواییێ هما بێژە رابوو بوو. ئەو ژی گەرا ژ بو گەشت و سەیرانا فەقییا یا ناڤدار بوو، گاڤا بهار دهات شینایی و زەرزەوات پر دبوو، گوشتی کار و بەرخا ژی خورت دبوو و دهاتە خوارن، هنگێ وەختێ گەشتیا فەقییان ژ دهات ئەو رادبوون هەبو هەبو ب گوند و مالێن خوەیتەرشی دەست ڤەکری دکەتن. وان هەو کار و بەرخ ددانە هەڤ و تانین گوندێ خوە. ژ گوند ژی وان هم دیسا کار و بەرخ و هەم ژی روون و ساڤار دچڤاند. ئەو ل گوڕ هاتنا گەرا خوە چەند ئێڤارێ ئینان دەردکەتن گەشت و سەیرانێ، ئانکو دچوون سەرێ گرەکی بەرگەهـ خوەش هەوالە یان ژی سەر مێرگەکە شینی ب کانی و ل ور بەرخ یان کارێ خوە دگوراندن چێدکرن و ب کێف و شاهـ ب گوڤاند و بێلمتە، ب هەنەک ولاکرتی دخوارن. جارنا هەنەکێن وان دبوون دار گەنەك و ل ور ب هەڤ ژی دکەتن لێ ئەڤ یەك پر کێم بوو هنەك جاران وان، فەقیێن گوندێ نێزی خوە ژی ڤە دخواند و هێ گەشتەکە مەزنی ب روومەتتر چێدبوو، ل گوڕ وێ گەشت خوارنازاف مروڤ دبێژە کێ وێ ئەو نەچن تایینا، لێ نا هەرێ ما فەقی دەڤ ژ تایینا بەردن؟



*Zirûf û Terkîba Kurdî ya çapbûyî (1966 ?), r.12 û 23.*

تێگوتن کو جارەکێ فەقی هەموو ل هجرێ ل هەڤ چڤیانە بەهسا خوارنێ کرنە، یەکی ژ وان گوتییە: (خوەزی وێگا هجر مە تژی کوتلك یان ژی ئاپراخ بوونا). یێت دن ژی ژێ پرسینە: (ما ئەمێ چەوا بچوونا تایینا؟).

## پەیڤا فەقی ژ فەقیها ئەرەبی تێ، بنگەهێ وێ ژی ژ پەیڤا فقهە ژ بو زانستیا شەریەتێ، ئانکو ڤانون و زاکولێ ئۆلی و جڤاکا ئیسلامێ، تێ گوتێن

د ژیانا فەقیتیێ دە جهەکی تایینا یێ گرینگ هەیە، فەقی ب سالا تایینا، (ل هنەك هەرێمان راتب ژێ تێ گۆتن) دژین. د گوندان دە یان د باژاران دە مالێ دەولەمەندی جامێر سبە و ئێڤاران تایینا فەقییان دەردخن، لێ یێت هالخوەش، دەولەمەندێ نەمەرد و مالکێمێن چاڤ فرە ژی دانەکی تایین دەرتینن. ئانکو ب گەلەمپەرێ هەر کەس ل گوڕی پیری و قەوەتا خوە، ژ بو بەلابوونا زانستیێ، ئالیکاری ب خوە ندەڤانان رە دکە.

هاتنەکە دن ژ فەقییان رە ئیسقاتە. گاڤا یەك دمرە میراتخورێت وی یان ل گوڕ وەسیەتا وی، یان ژی ل گوڕ هەبوونێ، ژ مالێ وی چەند کێل گەنم هەم ژ بو خێراوی وهەم ژی ژ دێلڤا گوناهێن وی ڤە بەلاڤ دکن. پرانیا ئیسقاتێ دکیهژە فەقی و مەلان، لێ هنەك ژی ژی دگەهێ رە بەنێن (فەقیر) گوند. ل ڤێ بوونێ مرتبا گەلەك جاران یارییا دکر: (ئەم دخوازن گەل زێدە بیە چکو زارووکەك چێدبە ئەم بەخشیشا خوە دستینن لێ فەقی و مەلە دڤێن خەلك بمرە چمکی ئەو ئیسقاتێ دستینن).

کێف و شاهییەکە فەقییا ژی ئەو بووکو یەك پرتووکەکێ






Rûpelek ji İsaxoci ya Esireddîn el Ebherî

خەلاس کەو دەست ب یەکە دن بکە. چمکی هنگی مەفتوهانە چێدبوون و وان یان ئێڤارا ئینەکی یان ژی رۆژا ئینی تێر چای و فێکی دخوار.

تو ژ زرووف و تەسریفا کوامانجی رە ژ دبێژی گەلو؟

زرووف ئەری لێ تەسریف نەزاف؟ کوردییا وی یەکجار ئەجێبە ب راستی من قەت ژ تو پرتووکێن سەرفی (لێکەرناس) هزر نەکر و کو د دەستی من دە بوونا من دی ژ یەکەکن و ئەمیسلەیی، پرتووکەکە کو لاپەراندنا لێکەران رێز دکە، پی ڤی تەڤا ژ ناڤ کتێبی رێزی دەرانینا.

- چەند پرتووکێن رێزی هەنە و د چەند سالان دە مرۆڤ دکهیژە یا تالبیی؟

هەڤالەکی پرس کر

- وهو.. پرن گاڤا هوون گهیشتنی هوونی ببینن.

- هما چەندکا ژ وان بێژی جێنا بە؟

- باشە، ئەزی سڤك ناڤی وان ل ڤر رێزکم، لێ گەرە ئەم دەست بە مەتنا بکن. چکو ئەم زاف پەییڤین، گەر هوون بڤێن ئەزی جار دن وان و نڤیسکارێن وان قەنجتر ب وە بدم ناسین لێ بەلێ ب سۆزی مەتنخوەندی.

مەگشا پێك ڤەگوت:

- چەوا بوون ژی دزانن، پشتی ختم و جاریکرنا قورانی ل پرێن جیهان مەرف مەولوودا کورمانجی، نووبهار و نەهجولەنمی (هەر دوژی کوردی نە) دخوینە و ب پرانی وان ژ بەر ژی دکە.

- بەلی ئەم زانن

- ل خوە وەدیدییە کو ل گەلەك جیهان خایەت و ئبن ئال-قاسمی (دو پرتووکێن بنگەهین و هێسایی یێن شەریەتی، زاکۆنا ئۆلینە) ژی بوو وان تێنە خوەندن.

- بەلی مە ژی خوەند- هنا ژ مە بەرسیڤادا

- تشتێن کو ئەز بێژم ل گۆر ڤان هێلێن مە نە، لێ هن جیهێن جودا ژی هەنە. پشتی ڤانی هان ل گەلەك ئالییان تەسریفا کورمانجی، تەمسیلە مینا، لززی جارنا مەقسوود و مەراهی ژی د بەشا لێگەرناس (سەرف) یی دە دخوینن و وان ژ بەر ژی دکن. ل دو ڤان دۆرا بوێژناس (مۆرفۆلۆژی) و هەڤۆکرستی (تەڤگەرزانی، ستیناکس) یی تی، ل ور ژی مرۆڤ پێشی، ئەوا مالا جورجانی، زورووف و تەرکیبی (ئەڤ هەر دویی دوای ب کوردی نە) دخوینە. د بە پەی ڤان دە ژی سابولاها سەخیر (بچووك) تی، ئەڤ ئەوا مالا جورجانی شروڤە دکە و نابی ژ بەرکرن. ئەز باوەرم هوون ژی هەیاڤرزانن

ژ خوەکێم جارا شروڤە دهاتن ژ بەرکرن، چکو ئەو کەلەکی درێژ بوون و ژ بۆ فێربوونەکە کوور دهاتن خوەندن. یەکی وان قەنج رەوادکر لێ مەتنێن (هیم و بنیات) وان ژ بەر دکر.

- هەیا ڤر مرۆڤ خوەش لێ دچە و گەلەك ژی مەفتووهانە (دەستیی شانە) ددە. ل پەی ڤان شەرە ئال- موخنی تی و پی رەهی نوو سەری مەرف دکەڤە خاخی گران. ئەو ب خوە شروڤەیا موخنیییە و هما چ بگر سالەکی دکشینە، هەیا مەرف وی د قەدینە بەزی چاڤی مەرف دەرتی. پشتی ڤی دیسا



دۆرا لێکەرناسیییێ تێ، ل ور مەرڤ شروڤە یا لزریێ، سەئەدینی دخونیە، یان پێ رە یان ژی پشتی وێ ل هن چیهان تەسریفا مەلە ئەلی ژی تێ خوەندن و ژ بەرکرن. بێ کو تەسریفا م. ئەلی دخوند هەر دۆ شرۆڤەیێ وێ، قزلجی و قەرەداخی ژی ژ بۆ ئالیکاری پێ رەدخوند. هنەک هەنە ل پێشییا دەست پێکا سەئەدینیێ، ستووریێ، کو راڤەیا پێش گوتن (دیباجی)ە سەئەدینییێ،دخوینن و ژ بەر ژی دکن. چکو دیباچەیا وێ تەڤ مانەند و میناهی (مەجاز و تەشبیحو)یە کو دکەڤە بەشا زانستییا رند پەیڤین (بەلاخەت)ێ، وگەلەکی زۆرە ئەو ب خێرا ستووریێ هەبەکی هێسایی دبە، لێ ژ بۆ کو هێ هێسا بیتربیە، گەلەک دو پەرتووکێن رند پەیڤینێ بێن بچووکی دن ژی دخوینن و ژبەردکن. ناڤێ وان ریسالەت ئال-وەد، و ریسالەت ئال-ئیستیارە یە. پشتی ڤان ژی هال ئال-مەقاد تێ کو شرۆڤەیا قەوادێیە.ل پەی هەللێ سەئەدوللاها گەوار تێ ئەو شرۆڤەیا ئەنموزەچییە پشتی ڤێ ژی یەکە تفاق و تەشقەلەتێ کونە تایچا شروڤەیا ئیزهاریە. مینا فالك گەلەکێن کو وێ دخوینن یان بوویەرەک تێ سەرێ وان یان ژێ تێ سەرێ لێزمەکی وان، ژ وێ بوونێ ژی گەلەکی مینا من کو رهشێرینن ژ خوەندنا وێ درەڤن و دشونا وێ دە ئیمتیهان و سیووتییێ دخوینن. لێ گەلەك ژی وێ سیووتییا راڤەیا ئەلفییەیا ئبنمالك کو ژ (١٠٠٠) بەیتی (رستە) پێکهتییە دخوینن. ل بەرکرن و بدەنگخوەندنا ئەلفیەیێ خوەش و گەشییەکە دنە دناڤ فەقییان دە و کو ل و کەسەرا دلێ هەر فەقییێ ژێرییە.

—ئەز نزانم بوو چەند هەب پرتووك و چەند سال ژی لێ پشتی ڤان نەڤاهێ مەرڤ دەست ب جامییێ، پەرتووکا تالیوونێ، دکە.

ل گۆر دەما هەڤجاخ (نووژەن) وەك مرۆڤ دەست ب ونیڤەرستیەیێ بکە. ل هنەك جیهان ژ هەللێ و هەفراز و ل هناژی ل دۆرا جامییێ. ب کتێبێن ریزێ رە هنەك پرتووکێن دن ژی تێنە خوەندن، فەنا یێن شەریەتێ (زاگۆن و قانوونێن ئولی و چڤاکی)، تەفسیرێ (شرۆڤەیا قۆرانێ)، هەدیسێ رگۆتن و کریارێت موهاممەد —پێغەمبەر (سەلاڤێن خودی سەربن)، سییەرێ (ژیانا موهمەد پێغەمبەر سەلاڤێن خودێ سەربن) و کێم جارا بەژی وێژە وستێر ناسیێ. ل پەی جامییێ ژی ئەو ژی دەمەکە درێژ دکشەو گەلەك ل ور ژێ دقەرن ژی، دورا مەندقێ تێ و دەست پێکا وێ ژی ب موحتنی ئەت-تولابێە کو شرۆڤەیا ئیساخوجییا(ل گۆر ئەل-مونجدێ) پورر فیریووس، شاکرتێ ئەفلاتۆن (پلتون)ە. لێ ل هنەك جیهان د شوونا ڤێ ئیساخۆجییێ دە مرۆڤ ئیساخۆجییا سەیدایێ مەلە خەلیلێ سێرتی دخوینە و ژ بەر دکە چکو ئەو درێژ تر و ناڤەرۆك

Rûpelek ji Kafîyeya Îbn el-Hacib (Îbn el-Hacib bi xwe Kurd e, di dema Eyyûbiyan de li Misirê bi cih bûne)

خورتتره. د پەی دە ژی قەول ئەل-ئەهمەد تێ کو ئەو ژی شرۆڤەیا فەنەرییا کو ل سەر ئیساخوجییێیە. ل دوو ڤێ دیسا بەلاخەت (رندپەیڤین) تێ، ئانکو یەك و ساما ئستیارێ و ساما وەدێ دخوینە. پشترە دۆرا مونازەرەیێ، کو ئاوایێ مونقەشە و گۆتۆبێژی ددە زانین تێ و پەرتوکێن وێ ژی (ئەل-وەلیدو ئەبد ئەل-وەهاب) ب. ژ جامییێ و درڤە ئەز ژی مینا وە مە چمکی من ب خوە ژی هێ نەخوەندییە، لێ تشتێ کو هن دیتییە و بهیتییە وەهایە.

هێ خەبەر د داڤ دە یەکی ژ پاشڤە گۆت:

– ئەز ب جامییا تە کم تە تەڤێ خوەندییە لێ تۆ جار دن لێ زڤری، م.هاجی هایدێ سەیدا ل بەندا تەیە.

بێ کو ئەڤ گۆت یەك ژ وان تالبێ کەڤنتر بوو. مە کر و نە کر وی خوەنەدا بەرگۆتنا پرتووکێن مایێ گۆت:

زوو وەرن ئەم هەرن دەست ب دەرسان بکن.

خوەرست ئەڤ کو ل دەمەکە درێژ د دلێ مە دەما، پشتی مە جیهێ خوە ژ ور خراکر و ئەم چوونە جهنە دێ کو هێ فەقی پر تر و بلندتر بوون، ئەم هنۆ هنۆ فێری وان بوون.



Rûpela pêşî ya Nûbara Ehmedê Xanî (ji kitêba Van Le Coq)

نایێ بیرا من چەند سال لی کەلەکی پشترە بوو کو ئەم چار پێنج هەب ژ وان فەقییێن بچووکی بەرێ ب هەق رە، ل گوندەکی دن لێ ل جەم ئەینی سەیدایی چڤیا بوون. ئەم گش بوو بوون تالب لێ ل ڤر ژی مینا جیهێ بەرێ تالبی تونە بوو. ئەم دیسا دکلاسکا خوەندنا خوە دە هاتبوون دەستپێکا وێ. یەکی ژ مە هاشییا دخوەند کو پشتی ئەبدەل-وەهابێ دهات. ئەو ژ دو پرتووکێن کو جامییێ دوور و درێژ شرۆڤە دکرن و ناڤێ وان ژی ئەبد ئال- خەفوور وسام بوو و یەکە دن ژی ب ناڤێ ئەبد ئال- هەکیم پێکدهات. یەکی ژی یا پشتی هاشییا دخوەند کو ل سەر مەنتقێ هێ کوورتر را بوەستییا و ناڤێ وێ ژی شەرە ئاش-شەمسی بوو. یێ ل پەی ژی ئال-موختەسەر دخوەند و دپەی وێ دە ژی شەرە ئال-ئەقاد کو زانستییا ئول ناسییێ (کەلام) بوو دهاتە خوەندن. یا داوی کو مرۆڤ پێ مەنتەهی دبوو و ژ دو جلدان پێك دهات ژی جەم ئال جەوام بوو. ئەو ل سەر بنگەهێ زانستییا ئولی بوو.

هەر یەك ژ مە کو دەست ب یەکێ ژ وان پەرتووکان دکر مە دەست پێشا نەیێن (مەفتوهانە) خوە دجڤاند،م.هاجی ب بیرتانی، جانێ وی شاد دکر و پشترە ژ دێلڤا وی ڤە ژ کێف دکر. د ناڤ وان پرتووکێن رێزێ تەڤ دە. بل ژ هەرسییێن پشتی قورانێ، د دەما مە دە تەنێ سێ پرتوکێن کوردی، وەك دەرس دهاتە خوەندن.

لی ل گەل وان، پشتی دەرسێ و دەمێن ڤالا دە، مە دیوانا مەلایێ جزیری و مەم و زینا ئەهمەدێ خانێ ژ دخوەندن. ب تایبەتی فەقییێن دەنگخۆش ئێڤارێ ئینییان ب ئاواز وەك قەسیدە دخوەندن داڤێتن بەرهەڤ .

ڤێ پاشییێ پرتوکەکە شەرینەتێ ب کوردی (ئیرشاد ئەل-ئبادا کورمانجی) ژی دەرکەوتبوو. ئەو ژی وەك ئالیکار، ژ بۆ ئاگاهدارییا ل سەر شەرینەتێ دهاتە بکارئانین.

**سەرچاوە:**

گوڤارا وان، ژمارە ٦
گوڤاری یەکێتیی نووسرانی کورد-سوێد





# پێشکەوتنی مرۆڤ لەڕووی هۆش و تواناکانییەوە

ئاریێز محەممەد یەحیا

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەمان و بێینە دوان و گفتوگۆ بەپێویستی دەزانین لەدەروازەی رابردووی پڕ لەنەهامەتییەکانی خودی مرۆڤەوە بچینە ژوورو بەم چەند وتانە دەست پێبکەین، بەر لەوەی مرۆڤ بتوانێ تەمی نامۆیی‌و هەستی خۆ بەکەم زانی بخاتە لاوە یەکپارچە ژیانی پڕبووە لەکارەسات و پەژارە. پشتی کۆم و خەمی ژێربارو تازیانەی دیاردە سروشتییەکان وای لێکردبوو بەردەوام ئەشك بڕژێتە چاوەکانی‌و بەسەر کوڵمەکانیدا جۆگەلە ببەستێ. دواتر لەگەڵ ئاوابوونی رۆژ بەدوای رۆژو پێچەوانەی لاپەڕەکانی مێژوو، بەکارامەیی‌و لێهاتووی خۆی توانیویەتی رووی رووداوەکان بچەرخێنێتەوە، ئەویش بەسوود وەرگرتن لەدووبارە بوونەوەیان بەمەش بەرگری‌و ململانێ‌و رووبەڕووبوونەوەی چەندان و هەروەها هەردوو رووی ماددی‌و مەعنەوی شکۆفانەترو پەرەدارتر بووە. ئەمەش هۆیەك بووە بۆ گەڵاڵە کردنی تاقی کردنەوەو لێکدانەوەی رووداوەکان و دەرەنجامی بیرو هزری نوێ‌و گۆڕینی سەوداو مامەڵە لەگەڵ ژینگەو دەورووبەرو بەخۆوە گرتنی قاڵبێکی دی.

ئەمەی لەسەرەوە خرایە روو کورتەیەك بوو وەك بیرەوەرییەك بۆ رابردووی کۆن و دیرۆکی ئەم زاتەی کە هەر لەسەرەتای دروست بوونییەوە بەوێنەی کارێکی نائاسایی‌و (معجزە) هێنراوەتە بوون.

بوونەوەرێکی وەها کە هەر لەگەڵ بیرۆکەی پەیدابوونی‌و هێنانی بۆ سەر ئەم زەمینە بتوانێت ببێتە مایەی سەرسوڕماندنی فرشتەکان و بەهەڵە بردنیان!!

دیارە مرۆڤ یەکێکە لەکارە نائاساییی‌و لەژمارە نەهاتووەکانی خوداوەندو ئاڵۆزترین بەدیهێنراوێك تا ئێستا بووبێت بێگومان ئەوە.. (معجزە) دیارە بەوە دەوترێت کە ئەگەر جگە لەخودا بالاّ دەستترین کەس بێنی ئەم توانایەی نەبێت بەلای دروستکردنییەوە بچێت.

ئەمڕۆ زیاتر لەهەر سەدەو رۆژگارێکی رابردوو مرۆڤ لەبەرە و پێشەوەچوون دایە. بەم بیروهۆشە کەم و کورتەی یەزدان پێی بەخشیوە زۆر کاری داهێنان و دۆزینەوەی لەسەر شانۆی ژیاندا خستۆتە روو، تەنانەت وای کردووە خودی خۆی سەرسام و بێبڕوا بکات. ئەو مرۆڤەی تا دوێنێ لەژێر رکێفی دیاردە سروشتییەکاندا دەیناڵاند ئێستاکە لەگەڵ نوێترین دەزگاو ئامێر سەوداو مامەڵە دەکات. دواتر هەر




**ئەمڕۆ زیاتر لەهەر سەدەو رۆژگارێکی رابردوو مرۆڤ لەبەرە و پێشەوەچوون دایە. بەم بیروهۆشە کەم و کورتەی یەزدان پێی بەخشیووە زۆر کاری داهێنان و دۆزینەوەی لەسەر شانۆی ژیاندا خستۆتە روو**

لەسنووری ئەو هێزەی پێی دراوە یاری بەئاڵوگۆڕکردنی ئەندام و ئامێرەکانی لاشەی گیانەوەران تەنانەت خۆیشی دەکات. ئەوەتا ئاڵۆزترین شتێك لەخۆیدا کە سەریەتی ئەیگۆڕێت و دەینێتە سەر لاشەی ترو چەندان شتی دی. ئیتر ئینسان زۆر لەشێوە سەرەتاییەکەی دوورکەوتۆتەوە، لەوانەیە ئەگەر بگونجێ کەسێکی ئێستاو یەکێك لەمرۆڤە سەرەتاییەکان بەراورد بکەی رەنگە ئاسمان تا رێسمان جیاوازییەکانی ئەوان بێت لەرووی دوورییەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئێستاو دوارۆژیش لەتوانستی ئەوا نییەو ناشبێت تاکێکی وەك خۆی لەرەنگ و شێوەو پێکهاتەکاندا بهێنێتە ئاراوە.

دیارە مرۆڤ دوولایەنە بەدی هاتووەو خۆ دەنوێنێ (گیان و لاشە) هەریەکە لەم دوو لایەنەش جیان لەیەکتری لەرووی چۆنیەتی پێکهاتن و شێوەدا. لەرابردوودا دەیان گوت (لاشە بەندیخانەی روحە) ئیتر ئەم بەندیخانەیە هەرچۆنێك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و ئەندازەو شێوەی چۆن بێت لەتوانادا هەیەو دەشێ دەسکاری بکرێ. بەڵام (روح) کە کۆیلەو بەندکراوە تیایدا لەبەر ئەوەی هەستی بینایی‌و چاوەکانمان کزو بێتواناییە لەئاست بینینیدا ناشێت هیچی لەگەڵدا بکرێت. ئەمڕۆش ئەگەر مرۆڤ (سەر، دڵ، قاچ، دەست) یا هەر بەشێکی تری گۆڕینەوەی لەگەڵدا بکرێت ((تەنانەت بەکاری لەبەرگرتنەوەش (استنساخ) کە لەلایەن زاناو بلیمەتێکی ئەمریکی لەم دوادوایانەدا ئەنجام دراوە)) ئەوا هیچ لەمەسەلەی (معجزە) بوونی ئەو ناگۆڕێت.. یەزدانی مەزن دەفەرموێت: ﴿ **وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الرُّوحِ قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً/ سورة الاسراء-٨٥** ﴾ لەو ئایەتەدا ئەوە دەردەکەوێت کە سنووری کارکردن لەبەردەمی مرۆڤ ئەوەندە بەرفراوانە بەجۆرێك تەنیا نەتوانێت دەسکاری‌و یاری بەروح بکات.






# گرنگی بوونی هەستی نەتەوەیی لە ئیسلامدا

مەریوان مەلا عەبدوڵلا

بوونی چەندین نەتەوەو رەگەزی جیا بەیەکێك لەنیشانەکانی گەورەی خوای پەروەردگار دادەندرێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ / سورة الروم-٢٢﴾ هیچ کاتێکیش نەتەوە و خۆشەویستی نیشتمان تاوان و گوناهو کارێکی ناڕەوا نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە کارێکیی پیرۆزیشە (حب الوطن من الایمان). کەواتە بوونی زمان و رەنگ و روخسارو نەتەوەی جیا بەڵگەیێکە لەسەر گەورەیی خوا هەر کەسێکیش دژی ویست و ئارەزووی خوای مەزن بێ ئەوا دەبێ زۆر زوو بەئاگابێتەوەو بەخۆی دابچێتەوە.

یەکێك لەو بابەتانەی ئیمڕۆکە لەمیدیاکانی کوردستان زۆر بەگەرمی باسی لێدەکرێ مەسەلەی نەتەوایەتییە، کە هەر یەکێك دەیەوێت بەپێی مەبەستی خۆی باسی لێوە بکات و زۆرێکیش وا دەخەنە روو کە ئیسلام دوورە لەنەتەوەو خۆشەویستی نەتەوایەتی، ئەمە لەکاتێکدا کە ئیسلام زۆر بایەخ بەو لایەنە دەدات و قورئانی پیرۆز وەکو بەرنامەیەکی خوایی لەچەندین شوێندا باس لەبوونی نەتەوەو گەلان و زمان و فەرهەنگی جیا کردووە لەهیچ شوێنێکدا بەبێ نرخ باسی نەتەوەی نەکردووەو تەنها جیاوازیش کە ئیسلام لەنێوان نەتەوەکانی کردبێ مەسەلەی لە خوا ترسان و دینداریە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ / سورة الحجرات-١٣﴾ لەم ئایەتەدا راستی بوونی نەتەوەو گروپی نەتەوەکانی روونکردۆتەوە، هەروەها پێغەمبەرمان محەممەد(د.خ) لەفەرموودەیەکیدا سەبارەت بە بەرگری کردنی مرۆڤ لەخاك و نیشتمانەکەی دەفەرموێت: (**خیرکم المدافع عن عشیرة مالم یأثم**) کە دیارە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر سەرچاوەکەی لەئایینی ئیسلام وەرگیراوە، چونکە: ﴿**وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى / سورة النجم-٣-٤**﴾ ئەمەجگە لەوەی کە خودی پێغەمبەری پێشەوا(د.خ) ئەم هەستە پاکەی هەبووە بەرامبەر بەخاك و نیشتمانەکەی ئەگەر سەیری رووداوی کۆچە مێژووییەکەی پێغەمبەر بکەین لەشاری (مەککە) بۆ شاری (مەدینە) دەبینین بەر لەوەی پێغەمبەر شار بەجێبهێڵێ لەدوا خاڵی سەر سنووری مەککە وەستاو سەیرێکی شاری کرد و فەرمووی: (**ما اطیبك من بلد واحبك الي ولولا ان قومي اخرجوني فيك ما سكنت غيرك**) ئەمە وێڕای ئەوەی لە (٣٣٣) شوێنی قورئانی پیرۆزدا باسی (قوم)و نەتەوە کراوەو رێگەش دراوە بە خوێندنی قورئانی پیرۆز بە (٧) شێوە (لەهجە) بەوانەش دەگەینە ئەو راستییەی، کە ئیسلام جگە لەوەی بوونی نەتەوەو خێڵ بەواقعێکی کۆمەلایەتی گرنگی داناوە لەهەمان کاتیشدا دژی دەست درێژی کردنی هەر





**قورئانی پیرۆز وەکو بەرنامەیەکی خوایی لەچەندین شوێندا باس لەبوونی نەتەوەو گەلان و زمان و فەرهەنگی جیا کردووە لەهیچ شوێنێکیشدا بەبێ نرخ باسی نەتەوەی نەکردووە**

نەتەوەیەك بووە بۆ سەر ئەوی ترو بەرگری کردنیشی بەکارێکی رەوای هەموو تاکێکی کۆمەڵ داناوە. ئەوەتا خوای گەورە زۆر بەراشکاوانە ئاماژەی بۆ ئەم راستییە کردوەو دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ / سورة البقرة-١٩٤﴾.

بۆیە خۆشەویستی نیشتمان و پارێزگاری کردنی لەگیانی نەتەوەیی و بوونی نەتەوایەتیمان نەك تەنها کارێکی پیرۆزە، بەڵکو ئەرکێکی هەرەگرنگی ئایینییە، هەر پروپاگەندەیەکی لەم بارەیەوەش بخرێتە پاڵ ئیسلام، ئەوا دوورە لە راستی و دەچێتە خانەی کاری بێ بنەما

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ هیچ کات خۆشەویستی نیشتمان لەچوارچێوەی خۆی دەربچێت و بەرەو دەمارگیری نەتەوەییمان ببات، چونکە رەگەزپەرستی (عنصرية) لەئیسلامدا دروست نییە پێغەمبەریش فەرموویەتی: (**ليس منا من دعا الى العصبية**) بەڵام کەمتەرخەمیمان بەرامبەر هەستی نەتەوەیی کارێکی مەترسیدارە بەتایبەتیش لەو سەردەمەدا، چونکە ئیمڕۆ لە هەموو شت زیاتر دەبێ بیر لەدروستکردنی هەستی نەتەوەیی بکەینەوە لەلای تاکی کورد نەك هەوڵی لاواز کردنی بدەین، چونکە مەترسیدارترین پیلان چاندنی تۆوی دژی بەئایدیۆلۆژیای نەتەوەییە. مێژووی کورد هیچ جۆرە

**ئیسلام دژی دەست درێژی کردنی هەر نەتەوەیەک بووە بۆ سەر ئەوی ترو بەرگری کردنیشی بەکارێکی رەوای هەموو تاکێکی کۆمەڵ داناوە**

چەوساندنەوەی ئایینی و مەزهەبی نیشان نادات تا هەستی نەتەوەیی و نیشتمانیش لەکوردستان سەری هەڵدا رۆڵەکانی کورد دەستیان نەدایە چەکی بەرگری و خەباتکردن ئەوجا دۆزی کورد گۆڕاو گەشەی کرد.

بۆیە هاندانی هەندێك خەڵکی بۆ بێ هێزکردنی هەستی نەتەوەیی لەلایەن سەرانی ولاتانی بەناو ئیسلامی زیاتر زەرەر بەو ئەزموونانە دەگەیەنێت، چونکە بەر لەراپەڕین لەو کاتەی کورد قەتل و عام دەکرا کیمیا باران و زیندە بەچاڵ دەکراو گوندو دێهاتی کوردان دەسووتا لەکوێ بوون ئەو موسڵمانە راستەقینانە بۆ دەنگیان لێوە نەهات و هەڵوێستی ئیسلامیانەی خۆیان رانەگەیاند، کەواتە ئەم دەست لەپشت دانەو یارمەتی دانە زیاتر زیان بەبوونی نەتەوەی ئێمە دەگەیەنێ و بەرەو ئاقارێکمان دەبات نە لەئێستاو نە لەئایندەشدا سوودی لێ نابینین.

ئەم قۆناغەی ئێستامان وا دەخوازێ هەرچی لەتوانادایە بەگەڕ بخرێ بۆ زیاتر قووڵکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی بەشێوەو شێوازێك لەنێو دڵ و دەروونی تاکەکانی





**خۆشەویستی نیشتمان و پارێزگاری کردنی لەگیانی نەتەوەیی و بوونی نەتەوایەتیمان نەک تەنها کارێکی پیرۆزە بەڵکو ئەرکێکی هەرەگرنگی ئایینییە**

**ئەم قۆناغەی ئێستامان وا دەخوازێ هەرچی لەتوانادایە بەگەڕ بخرێ بۆ زیاتر قووڵکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی**

کۆمەڵ بچەسپێت، چونکە ئەم قووڵکردنەوەیە هیواو خەون و ئاوەتەکانمان دێنێتە دی.

لەدوماهیدا ئەوەی گرنگە بخەینە روو ئەوەیە هەموومان هەوڵ بدەین بەر بەم لاواز بوونە بگرین و بەبەرنامەی تازەو نوێ لاوانمان لەسەر هەستێکی پاکی نەتەوەییانە پەروەردە بکەین، چونکە کێشەی ئێمەی کورد کێشەیەکی ئایینی نییە، بەڵکو کێشەیەکی نەتەوەییە کە بەدرێژایی مێژوو تووشی ئاوارەیی و دەربەدەری و ئەنفال و کیمیا باران بووە، لەبەر ئەوە تووش نەبووە کە موسڵمان بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بووە کە ئێمە کورد بووینە هەر بۆیەش زۆربەی شالاوەکانی رژێمی بەعسی لەژێر ناوی پیرۆزی ئیسلامەوە کراون وەکو جەنگی (قادسیەو ئەنفال) بۆیە رێگە گرتن لەدروستبوونی هەستی نەتەوەیی تاوانێکی گەورەیە جا هەر کەسێك و لەژێر هەر ناوێك بکرێت، چونکە کورد وەکو باڵندەیەك وایە کە دووباڵی هەیە کە ئیسلامەتی و کوردایەتییە جا نەکوردایەتی بەبێ ئیسلامەتی نەئیسلامەتیش بەبێ کوردایەتی، کەواتە هەردووکیان بەیەکەوەن و تەواوکەری یەکترین. ئێمەی کورد مافمان خوراوە با هەوڵی بەدەست هێنانەوەی مافەکانمان بدەین، کەیەزدانی مەزن پێی بەخشیوین و چیتر لەبەر خاتری خەڵکی تر پێ لە مافەکانی خۆمان نەنێین ئەگەر دڵسۆزیش بین بۆ ئاینەکەمان باخەم بۆ ئەوە بخۆین کە نەتەوەکەمان سەربەرزو سەرفراز بژیت. خوای گەورەش هەموو لایەکمان بخاتە سەر رێگای راست.

**تێبینی/**

بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم بابەتە سوودم لەو سەرچاوانەی خوارەوە وەرگرتووە:

١. نامیلکەی (لەپێناو هوشیاری نەتەوەییدا) نوری بێخالی: بلاوکراوەی رۆژنامەی میدیا ژمارە ٧/٢٠٠٠.

٢. رۆژنامەی برایەتی ژمارە، ٢٥٥٧، بیری نەتەوەیی و مەبەستەکانی شێواندن: سەعد عبدالله.




# مشەخت بوون، ئەگەرێن وێ

هادی ولاتی

پێکهاتنا چڤاکی د ئەنجامێن چەندین ئەگەرێن رەوشەنبیری و سیاسی و چڤاکی و ئابووری.. د ناڤ دچن و رێڤەبرنا وێ ب زەحمەت دبیت، ژ کاروانێ ژیارو مەدەنیەتێدا دێ ڤەمینێت و ناهێتە کونترول کرن. د ئەنجامێن ڤان هەمی ئەگەران گەلێك دیاردێن نێگەتیڤانە پەیدا دبن، کو هەر ئێك ژ ڤان دیاردانەش دبنە ئەگەرا تێك دانا شیرازا چڤاکی و لێکهەلوەشاندنا هەڤبەندییێن د ناڤبەرا ئەندامێن چڤاکی دا. ئێك ژ ڤان دیاردانە کونها ل ناڤ چڤاکێ مەدا پەیدابوویە ئەو ژی مشەخت بوونە. مشەخت بوون ب رەنگەکێ سەرەکی ل رۆژهەلاتا ناڤین دیار د کەڤیت. کو ئەندامێن چڤاکی رۆژهەلاتی پشتاخوە ددەنە وەلاتێ خوە بەرەڤ وەلاتێ غەریبیێ. ولاتێن رۆژئاڤا مشەخت دبن. کوچەندین پسپور و گەنج و رەوشەنبیر و زارۆك و ژن و پیر جەنتێن خوە هەل دکرن بەرەڤ وەلاتێن رۆژئاڤا دچن، خودا حافیزیێ ژ وەلاتێ خوە دکەن. ئەڤە ژی کارتێکرنەکا نێگەتیڤانە ل سەر وان وەلاتان مشەخت بو دبن هەیە. نها بۆیە ئارایشەکا نێڤ نەتەوەیی نەمازە ل ڤان چەند سالێن دوایدا کو ب رەنگەکێ سەرەکی بەرەڤ زیاد بونێ دچن. لەورا مللەتێ کورد ژی ئێکە ژ مللەتێن رۆژهەلاتا ناڤین کو ژ بەر ڤێ پێلی کەتییە. پاش راپەرینا مەزن دیاردا مشەخت بونێ ب هەر دوو رەنگێن ئاسایی و نائاسایی دیار کەفتییە. ئەڤ مشەخت بونەش هەمی چینێن چڤاکی ڤە دگرێت. رەوشەنبیر، ماموستایێن زانینگەهێ، پسپور، گەنج و پیرو زارۆك ئەڤە ژی دئەنجامێن چەندین ئەگەرانن. لێ جهێ داخ و گوڤانایە کو پرانیا ڤان کەسان توشی چەندین کارەساتادبن. مینا هندەك ژ ڤان کەسان دبنە خارنا نەهنگ و ماسی یا، هندەکێن دن ل سەر توخیبی توش دەست دریژیا کەمینادبن، یاخود ل سەر توخیبیاندا چەندین مین دبن پیێن وان د پەقن و گیانێن خوە ژ دەست ددەن، ئانکو دبنە قوربانێن قاچاخچیا. هندەکێن دن دەمێ دەرباز دبن و کەڤنە وان ولاتان کو وان دڤێت، لێ ور ژیانەکا مەرگەساتی دبنە سەر، پەرەگەندە دبن ل سەر شەقام و کولانان ئو دبنە جهێ ترانێن خەلکێن وان ولاتان، کو ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرا هندێ کو توشی دەرونیەکا ئالوز ببن، وەسا توشی نەخوشیەکا دەروونی دبن کو بێ ئومێدبن هەڤبەرڤێ ژیانێ.

## ئەگەرێن مشەخت بوون

ڤێرەدا من دڤێت وان ئەگەرا دیاربکەم کو دبنە ئەگەرا مشەخت بونا گەنج و خورتێن ولاتێ مە، هەر چەندە گەلەك ئەگەر هەنە لێ ڤر بەحسێ هندەك ئەگەرا دێ کەین، هەر ئێك ژ ڤان





ئەگەران ژی کارتێکرنەکا مەزن ل سەر دەروونیێ گەنجا هەیە. کو وەلێ دکەن هەمی هزرا هاندەران بکەن، خوە رزگار بکەن ل ڤان ئەگەران.

١. ئەگەرێن سیاسی: مشەخت بون شتەکی غەریب نییە دناڤ چڤاکێ مەدا، چونکی ولاتێن داگیرکەر چەندین زۆلم و زۆری ل مللەتێ کوردان کرییە، چ بوغزوقین دناڤ دلێن واندا هەنە هەڤبەری مللەتێ کورد ئەنجامدایە، ڤان هەمیێ زۆلم و زۆریێ وە ل مللەتێ کورد کرییە کو توشی دەربەدەری و ئاوەرەیی و مشەخت بونێ ببن. مینا پاش تێك چونا پەیمانا سیڤەر کو رەوشا کوردێن باکور تێك چوو کو چەندین نڤیسەر و زانا و پسپور و گەنج بەرەڤ ولاتێن دن مشەخت بونە. ئانکو دەمێ بارزانی و هەڤالێن خوە ل ئاڤا ئاراس دەربازبوون و ل ولاتێ یەکێتیا سوڤێتیا پێشیێ ئاکنجی بون. یاخود کورەوەریا سالا ١٩٩١. بێ تەڤە مشەخت بونە و قازانجا مللەتێ کورد دابویە.

پاش راپەرینی ئەو زۆلم و زۆری بەرەڤ نەمانی چوو، لێ توشی شەرەکی ئیجگار مەزن و خەتەرناك بوین ئەو ژی شەرێ براکوژی بوو. کو زیانەکا مەزن ل دۆزا مللەتێ کورد گەهاند، چ ل ئاستێن ناڤخۆیی یا چ ل ئاستێن دەرڤەی!. د ئەنجامێن ڤی شەرێدا خوینا چەندین گەنج و خورتان ب فیرۆچوو. بێ ئومێدی و رەوشبینی ل دەڤ گەنجێن مەدا پەیدابوو دهەڤبەر ئایندا دۆزا کوردان. ئەڤ شەرە کارتێکەرنەکا مەزن ل هەست و دەرونێن گەنجێن مەدا کرییە. کو وەلێ کرییە کو هەردەم هزرا هاندەران بکەن ژ کو دویرکەڤن ژ هەمی ئارایشێن سیاسی.

**مشەخت بوون**
**هەمی چینێن چڤاکی**
**د رەوشەنبیر، مامۆستا، پسپۆر،**
**گەنج و پیرو**
**زارۆك**
**ڤەدگریت**

٢. ئەگەرێن ئابووری: ل پاش راپەرینا مەزن ئارایشا ئابووری ب زەڤی سەرهەلدا، ئەو ژی دئەنجامێن دوو ئابلوقێن ئابووری ل سەر کوردستانێ، کو بویە ئەگەرا تێك چونا بارێ ژیانا خەلکی ژ روویێ ماددی ڤە. د ئەنجامێن ڤێ ئێکێ ژی بێکاری د ناڤ جڤاکی مەدا بەرەڤ زیادبونی دچو، ب تایبەتی د ناڤ تاخێن گەنجاندا. ئەڤە ژی بۆیە ئەگەرا هندێ کو نەکارن هەمی هەست و هیڤێن خوە مسوگەربکەن. ئەڤە ژی بۆیە ئەگەرا هندی کو گەنجێن مە هزرا هاندەران ل مەژیێ واندا بزڤریت و روو ل هاندەران بکەن.

٣. ئەگەرێن چڤاکی: هەڤبەندین چڤاکی د ناڤ ئەندامێن چڤاکێ مەدا رۆژ ب رۆژ کێم دبیت، یاخود هندەك تیتال و داب و نەریت د ناڤ چڤاکی مەدا هەنە ناگونجێن دگەل واقعی نها. کو هەرئێك ژ ڤان داب و نەریتانە کارتێکرنەکا نێگەتیڤانە ل سەر دەرونێن گەنجێن مەدا پەیدا دبن، کو وە ل گەنجێن مەکرینە کو هەردەم دورەپەرێز و غەریب و رەش بین بن دناڤ چڤاکیدا.

٤. ئەگەرێن دەروونی: ئەو هەمی ئارایش و گیروگرفتانە کو ل ناڤ چڤاکیمەدا پەیدابوونە یاخود ل سەر ئەندامێ، چڤاکیدا چەسپانە چ ل روویێ سیاسی و چڤاکی و ئابووری کو ئەو هەمی هیڤی ئاواتێن وان هەنە دێ هێتەبن ئاخ کرن و ناگەهنە چ داخازێن خوە. ئەڤ هەمی ئارایش کو ل دەڤ گەنجێن مەدا پەیدادبن بویە بەردەوام پەنا بۆ خەیالا دبن تاکو بکارن ل رێیا ڤان خەیالاندا حەزو هیڤی و ئاواتێن خوە بهێنەدی. ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرا هندێ کو هەردەم ل ناڤ





حالەتەکی دەروونی نا سروشتی دابێت. لەورا هەردەم پێکولێ دکەت کو ل ناڤ ڤی دەروونی وا رزگار بیت و روو ل هاندەران بکەن. لێ دەمێ کودەرباز دبن و دگەهنە ولاتێن رۆژئاڤا توشی چەندین نەخۆشییێن دەروونی دبن، چونکی د ناڤ ژیانەکا نەخوەشدا دژین، ژیان ل سەر شەقام و کولانان دبنە سەر، دبنە جهێ ترانێن خەلکی.

٥. ئەگەرێن چاڤ لێکەریێ. کو ئەڤە ژی نها ئەگەرەکا گرنگە بو مشەخت بونا گەنجان. زۆربەی ئەو گەنجێن کو مشەخت دبن ئەگەرێن چاڤ لێکەرینە دەمێ کو ئێك ژ هاندەران بێتەڤە، ب کێم دەرامەتیش بێت ب ئوتومبیلەکا نوی و برنا جانترین کچ و پویتە پێکرن ل دەڤ خەلکی، وە ل گەنجێن دن کەن کو هزرا هاندەران بکەن.

٦. دانەمەزراندن خودان شیان دجهێن خوەدا: واتە ئەو کەسێن کو پسپورن ژ بوارێن خوەدا، ل جهێن ناهێتە دامەزراندن بەلکی کەسێن دن کو نەشایستێ وی جهنە ب ئەگەرا واستە ل جهێ واندا دهێتە دامەزراندن.

٧. پویتە و بایەخ دان ب وان کەسان کو ژ هاندەران دهێنەڤە: ل ڤردا دەزگەهێن راگەهاندنێ دەورێ خوە دبینن بۆ مەزن کردن و پویتە دان بو وان کەسان. دەمێ هوزانڤانەك، مامۆستایەك، گۆرانی بێژەك، نڤیسەرەك دهێتەڤە، دێ بینین کوچەندین رۆژا بەرنامێن خوە تەرخان دکەن ب ڤان کەسان. یاخود بەرهەمێن وان دهێنە چاپ کرن. یاخود خەلکێن دن پویتە پێ ددەن و کچێن خوە ب جانترین رەنگ دێ رازینن دکەنە دیاری ب وان کەسان کو ژ دەرڤەی ولاتێ دهێنەڤە، رێزەکا مەزن ژی لێ دکرن.

٨. هەبونا ململانا ئایدۆلوژیو پارتێن سیاسی د گورەپانا هەرێما کوردستانێدا. کو ئەڤ ململانە ب رەنگەکی نا دروست ب کار دەهێت. دبیتە ئەگەرا هندێ کو ب رەنگەکی راستەڤخو دەست ب کاروبارێت خودان پسپور و شیان وەربدەن. هندەك جارا ژی ئەگەر تەزکیە ژپارتێن دەستەلادار نەئینن ناهێتە دامەزراندن.

٩. نەبونا مەلبەند و دەزگەه بو گەنجان کو بکارن هیڤی و ئومێدێن خوە ب جه بینن. مینا بنکەهێن وەرزش، پارك، بنکەهێن هۆی کرنێ ب خورایی کوبکارن دڤان بنگەهاندا هیڤی و ئارازوێن خوە ب جه بینن.

١٠. نەبونا ئازادیەکا رەها ل دەڤ گەنجان، کوبکارن ئەو شتێن ل دل و دەرونێت واندا هەنە ب ئازادی و بێ ترس، بێ سانسور دەربێخن. لێ ئەگەر نەکارن دەربێنن دبیتە ئەگەرا هندێ کو مشەخت بن بو هاندەران.

## مشەخت بون د روانگا شەریعەتا ئیسلامیێدا

ئەو خالێن کومن ئامارە پێکری نابنە ئەگەرا مشەخت بونێ دچارچیڤی ئاینی ئیسلامێدا. لەوانەیە هندەك کەس وەسا هزر بکەن و بێژن مرۆڤ دکاریت ل ولاتێن کفری ئاینی خوە بریڤە ببەت و ئازادیا ئولی یا هەی، لێ ئەڤە هەمما بەروڤاژینە. ئەو کەسێن مشەخت دبن ب ئەگەرا باری ئابووری ئەڤە نابیتە ئەگەرا شەرعی بونێ. چونکە خودێ رزقێ مرۆڤی ددەت ل هەر جهەکی بیت ل ڤێرە ئانکو ولاتێن دن. لەورا ل چەندین ئایەتاندا ل قورئانی پیرۆز خودێ ئامارە پێکرییە هەروەکی خودی دبێژیت:﴿وَفِي

## هەڤبەندین جڤاکی د ناڤ ئەندامێن جڤاکێ مەدا رۆژ ب رۆژ کێم دبیت




﴿... السماء رزقكم وما توعدون/ سورة الذاريات-٢٢﴾، ﴿الله الذي خلقكم ثم رزقكم ثم يميتكم ثم يحييكم/ سورة الروم-٤٠﴾، ﴿قل من يرزقكم من السماء والأرض أمن يملك السمع والأبصار/ سوره يونس-٣١﴾ هەروەكی پێغەمبەر (سەلاڤێن خودێ ل سەربی) دبێژیت: (لو انكم تتوكلون على الله حق توكله لرزقكم كما يرزق الطير).

لەورا مشەخت بوون ژ بەرئەگەرێن ئابووری رەڤینە ژڤەوەدا خودێ، كو ئەڤە ژی جی نابیت یاخود مرۆڤ ژبەر هەر ئەگەرەكێ دن بن چ سیاسی، رەوشەنبیری، دەروونی، چڤاكی.. ئەڤە ژی نابێتە ئەگەرا شەرعی بۆنێ، چونكە ئەڤ ژیانا دنیایی جهێ رابرادنێ وییێن قەوانێ نییە، بەلكی جهێ تاقی كرنێ و هەڵسەنگاندنا مرۆڤانە. هەر ژ بەر ڤێ ئەگەرێ ژی خودێ مەزن جورەها هەل سەنگاندن و تاقی كردنەڤە تێدادانایە. تاكو مرۆڤێن خودان ئیمان و دلسوز و راستیا بیروباورا خەلكێ بوسرمان دەركەفیت. خودێ مەزن ل چەندین ئایەتاندا بەحس كریە هەروەكی دبێژیت: ﴿ولنبلونكم بشيء من الخوف والجوع ونقص من الأموال والأنفس والثمرات وبشر الصابرين* الذين إذا أصابتهم مصيبة قالوا إنا لله وإنا إليه راجعون* أولئك عليهم صلوات من ربهم ورحمة وأولئك هم المهتدون/ سورة البقرة/ ١٥٥-١٥٧﴾، ﴿الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملاً/سورة الملك-٢﴾، ﴿ونبلوكم بالشر والخير فتنة وإلينا ترجعون/ سورة الانبياء-٣٥﴾، ﴿أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون* ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا وليعلمن الكاذبين/ سورة العنكبوت-٢-٣﴾.

هەروەكی پێغەمبەر (سەلاڤێن خودێ ل سەربی) دبێژیت: (عجباً لامر المؤمن ان اخره كله خير وليس ذاك لاحد الا المؤمن ان اصابته سراء شكر فكان خيراً له، وان اصابته ضراء صبر فكان خيراً له) (رواه مسلم) دڤان ئایەتاندا بو مە خویا و ئاشكرا دبیت كو نارەحەتی و تاقی كردنەڤە بو دەرخستنا دیوی ناوەوەی مرۆڤانە تا چ رادەیەكی ئیمان تێدا دامەزرایە؟ چەند باوەری ب پشت ڤانیا خودی هەیە؟ تا چەند خو راگرو ئارامگرە، ل هەر دوو حالەتدا واتە خوشی و ناخوشیادا؟ ئایا ئارام دگریت لوان جها كو ئارام گرتن دڤێت؟ شوكر و سوپاسیا خودێ دكات ل وان جهاكو جهێ شوكر و سپاسییە؟ ڤێجا رەڤین ل ڤر واقعی رازی نەبوونە ژ ئەمرێ خودێ و پێغەمبەری (سەلاڤێن خودی ل سەربن).

ئایا ئایینی ئیسلامێ رێ دەكات كو مرۆڤێن موسلمان مشەخت ببێت؟ ئانكو رێ و مەرج دانانە بۆ مشەخت بونێ؟ ئایا چ رەنگێن مشەخت بونێ بومە دیار كرینە؟ ئایا مرۆڤێن بوسرمان رەوایە و دروستە مشەخت ببیت بو ولاتێن كوفرێ؟ لەورا مرۆڤێن بوسرمان دبیت ل روانگەی ئیسلامێ دا مشەخت ببیت ئەو مەرج كو ئاینێ ئیسلامێ دانانە دبیت مرۆڤ ب پێی وان مەرجان مشەخت بیت. ئەم دكارین جورێك مشەخت بونێ ل روانگەی ئاینی ئیسلامێ بكەین پێنج بەش كو ب ڤی ئاوانیە:

١. ل ولاتێن كوفرێ بۆ ولاتێن كوفرێ:- ئەڤ جورە مشەخت بونە درستە ئەگەر ل وێ ولاتێن كو ئاكنجینە، زۆلم و زۆرداریەكا مەزن لێ بێتەكرن، ئوهەمی رێێن ئولی لێ بكرت و نەكاری ئولێ خوە ب رێڤەببەن ئومەترسیا هندێ هەبێت كو پەشیمان بین ل ئولێ خوە ل ڤی دەمیدا پێدڤییە مشەخت بن. مینا هەڤالێن




## ئارەحەتی و ئاقیکردنەڤە بو دەرخستنا دیوی ئاوەوەی مرۆڤانە تا چ رادەکی ئیمان تێدا دامەزرایە

پێغەمبەر (سەلاڤێن خودێ ل سەربت) دەمێ ل مەکێ مشەخت بوب بوون بۆ حەبەشێ. ل ب مەرجێك ئەو ولاتێن کو مشەخت دبن پێتڤییە خەلکی وێ پاکتر و باشتربن ل خەلکی ولاتێن خوە. ئەوەك بەروڤاژی.

۲. ل ولاتێن تێکەلاو بۆ ولاتێن ئیسلامێ: ئەڤ جورە مشەخت بونە درستە، وە هندەك جارا ژی واجبە. دەمێ ولاتێن بسرمانا توشی شەری دبن دگەل کافران ل وی دەمیدا پێتڤییە مشەخت بیت بو هاریکاری کرنا برایێن خوەیێن بسرمان.

۳. ل ولاتێن تێکەلاو بۆ ولاتێن کوفرێ: ئەڤ جۆرە مشەخت بونە دروست نییە نابێت مرۆڤ مشەخت بیت تەنها ژ بۆ کاروبارێت پێتڤی.

٤. ل ولاتێن ئیسلامێ بۆ ولاتێن کوفر تێکەلاو: ئەڤ جۆرە مشەخت بونە دروست نییە، چونکی ئەڤ جۆرە مشەخت بونە ترسناکە ل سەر دین و رەوشت و ئەخلاقێن مرۆڤان هەروەسا دبیتە سەرف کرنا پارەیەکی زۆر ئو ب هێز کرنا ئابوریا کوفرێ. فەرمان ل سەر مەکرییە کو هەمی گاڤا هەڤبەر کوفرێ راوەستین، هەروەکی خودێ ل قورئانیدا دبێژیت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ/ سورة التوبة/ ١٢٣﴾ مرۆڤ دکاریت مشەخت بیت بۆ وەلاتێن کوفرێ ب سێ مەرجان

١. دبیت زانستەکا باش هەبیت ئو مەلەڤان بیت ل شەرعێ خودێدا کو چ شوبهات کارتێنەکەن، چونکی کافر بەردەوام ڤیایە شوبهاتا بچێتە ناڤ دینی ئیسلامێ ئوهەڤبەر خودێ ، پێغەمبەر (سەلاڤێن خودێ ل سەربت)کو بکارن ڤان شوبهاتا رەت کەنەڤە و ئاشکرا بکەن.

٢. دبیت خودان باوەرەکا موکم، ئیمانەکا مەزن بیت کو چ شەهەوات کارتێنەکەت، چونکی ولاتێن کوفرێ نقوم بۆیە ل شەهەواتا مینا زینا، لیواط، ئارەق

٣. ئەگەر بو ئیش و کارێت پێتڤی بن مینا کەسێك نەخوەش بیت و چارەسەری ل وەلاتێن کوفری بیت. یاخود بچن بۆ خوێندنێ بو دەست ڤەئینانا زانستی لێ کو ل ولاتێن ئیسلامێ نەبیت. یان بو بازرگانێ بێ ب مەرجێ کو ب زوترین کات بزڤریتەڤە ، ل وێندەری ئاکنجی نەبیت.

٤. ب فتوایا ئەلبانی و ابن باز و ابن عثمین مشەخت بون بو ولاتێن کوفری حەرامە و چێ نابیت، ئەگەر ئەو مەرجێن ب رێ تێدانەبن.

٥. ل ولاتێن کوفرێ بۆ ولاتێن ئیسلامێ: ئەڤ جۆرە مشەخت بون دروست و واجبە. هەر بسرمانەك ئەگەر ب کاریت مشەخت ببت پێتڤییە مشەخت بیت. لێ ئەگەر ترسا نەبیت کول ئولێ خوە پەشیمان بیت، ئودکاریت بانگەوازیا خەلکی بکەت بو ئینانا ناڤ ئیسلامێ، ئەوا مانەڤە ل ولاتێن کوفری بۆ دروست دبیت.





# ئافرەت لەسایەی ئیسلامدا

هیوا عومەر ئەحمەد
کۆلیژی پەروەردە- کیمیا

ئەگەر هێزی بینایی چاومان هەزار هێندەی تر بوایە. خانەکانی مێشکمان ملیۆنان خانەی تری هەبوایە، هێشتا نەماندەتوانی خانەکانی مێشك و بیرو ئەندێشەمان پەی بەنازو نیعمەتەکانی خودای گەورە ببەین، بەڵێ چەندە جوانە کە سەیری دروستکراوەکانی خوا دەکەین، هەمووی سنووری بۆ داناوەو بەشێوەیەك رێکیخستووە کە مرۆڤ سەری لەرێکخستنەکانی سوڕماوە، مانگ و رۆژو ئەستێرەو.. هتد بۆ مرۆڤ و بۆ خزمەتی مرۆڤی دروستکردوەو پێوانەو سنووری بۆ داناوە. ئەوەتا هەر خۆی دەفەرموێ: ﴿**إنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ/ سورة القمر- ٤٩**﴾ جا پێش ئەوەی مرۆڤ سەیری دروستبوونی دەوروبەری بکا. دەبا سەیرێکی دروستبوونی خۆی بکاو بزانێ کە لەچی دروستی کردووە، چی بۆ دروستکردووە، بۆچی دروستکراوە با سەیری دانایای خوا بکا کە هیچ شتێکی بەتاك دروستنەکردووە نەك هەر مرۆڤ، بەڵکو بچووکترین شتی بەجووتە دروستکردووە بۆ بەردەوام بوونی ژیان، بەڵێ پیاوو ئافرەت هەردووکیان دروستکراوی خودان، هەردووکیانی بەمرۆڤ داناوەو خوا پەرستیو هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو ئاوەدانکردنەوەی ئەو زەویەی پێ سپاردوون، جا لەم چەند دێرەدا مەبەستمان مافی ئافرەتە لەئیسلامدا. چونکە ئیسلام مافی بچووکترین شتی لەبیرنەکردووەو رێساو دەستووری بۆ داناوە، چ جای ئەوەی ئافرەت کە مرۆڤەو خوداش رێزی لەمرۆڤ ناوە، ئەی ئەوە نییە خوا دەفەرموێت:﴿ **وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً/ سورة الاسراء-٧٠**﴾ ئەی باشە خۆ ئافرەت مرۆڤە، چۆن خوای گەورە جیاوازی لەنێوان رێزی پیاو لەگەڵ ئافرەت دەکا لەکاتێکدا هەردووکیان مرۆڤ و دروستکراوی خوان. خوای گەورە خۆی دەفەرموێت:﴿ **إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا* إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا/ سورة الانسان/٢-٣**﴾ بەڵێ خوا پیاوو ئافرەتی لەدڵۆپە ئاوێك دروستکردووە گوێی پێداوە بۆ ئەوەی گوێبستی حەق بێو چاوی پێداوە بۆ ئەوەی حەق ببینێ، جا رێگای راستیشی پێشانداون ئەگەر چاکەکارو موسڵمان بن پاداشتی خۆیان وەردەگرن، ئەگەر خراپەکارو بێ باوەڕبن ئەوا سزای خۆیان وەردەگرن، جا چ پیاوبێ یان ئافرەت.

پێش ئەوەی کە گزنگی خۆری ئەم ئیسلامە ئەم گەردوونە رووناك بکاتەوە، تاریکی باڵی رەشی بەسەریدا کێشابوو، مێژوو شاهێدە کە چی بەئافرەت، نەك هەر ئافرەت، بەڵکو بەچینی هەژارو بێ دەسەلاتی پیاوەکانیش دەکرا، دەکرانە کۆیلەو بەندەو ئیشیان پێ دەکرا. بەلام ئافرەت سەرەڕای دەردەسەری خۆی زیندە بەچاڵیش دەکراو شانازیش بەکوشتنەکەی دەکرا، بەلام پاش ئەوەی کە گزنگی خۆری ئەم ئیسلامە زەوی رووناك کردەوە، مرۆڤی لەبەندایەتی بەندان رزگار کرد بۆ بەندایەتی خوای بەندان (جاء الاسلام لغيروا الناس




مـن عبـادة العبـادة الى عبـادة اللــه الوحـدة)، ئـافرەتیش یـەكێك بـوو لەوانـەی كـە نـەك ئیسـلام لەزینده بەچاڵی رزگاری کردن، بەڵکو رێزی گرت و بـەرزی كـردەوە، ئیسـلام وای لـەمرۆڤ كـرد كـە ئەوانەی پێش ئیسلام كچی خۆیان زینده بـەچاڵ کردبـوو، کـاتی موسـڵمان بـوون، کـە سـورەتی (تکویر)یان دەخوێنـدەوە. تـا دەگەیشـتنە ئایـەتی (٩)ەم ﴿بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ﴾ دەستیان بەگریان دەکردو فرمێسـكیان بـۆ دەڕشـتن و داوای لێخۆشبوونیان دەکرد.

هەڵبـەت ئـەو کەسـانەی کـە تۆمەتی ئەوە دەدەنە پاڵ ئیسلام كە مافی ئافرەتی نـەداوە، ئەگـەر تۆزقـاڵێك زانیاریـان لـەبارەی قورئان و ئایەتی (١٩)ی سورەتی نسـاء﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ ئایەتی (١٨٧)ی بقرة ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ و فەرموودەی (اكمـل المؤمنـين ايماناً احسنهم خلقاً وخيـاركم خيـاركم لنسـاءهم) رواه الـترمذي. ئایەتـەکانی سـورەتی (نسـاء وبقـرة)و سورەتەکانی تری قورئانی پیرۆز هەبوایە دەمیـان لەئاسـتیدا لاڵ دەبـوو. ئەگـەر تۆزێـك شـارەزاییان لەژیانی پێغەمبـەری خـوا(د.خ) هەبوایـە چۆنیـەتی مامەلەکردنی لەگەڵ ئافرەتان بخوێندبایەوە، ئـەوا دیسان زمانی خۆیان لەشەرمان دەگەست. ئەوەتا لەپـەیمانی حودەیبیـەدا کـاتێك کـە بێبـاوەڕان نەیانهێشـت پێغەمبـەرو هـاوەڵانی حـەج بکـەن، پێغەمبەر(د.خ) پەیمانێکی لەگەڵ مۆر کردن کە تا ساڵێكی تـر حـەج نەکـەن، بـەڵام هـاوەڵانی هـەموو تووڕە بوون، وتیان نابێ بەسەر شۆڕی بگەڕێینـەوە زۆریـان پـێ ناخۆشـبوو. پێغەمبـەر(د.خ) فـەرمووی وشترەکانتان بکەنە قوربانیو سەری خۆتان بتاشن، بـەڵام کـەس بەقسـەی نـەکرد، ئـەوە بـوو پێغەمبەر(د.خ) بەدڵتەنگی چووە ژێر رەشماڵی (ام سلمە)ی دایکـی ئیمـانداران. جـا (ام سـلمە) لێـی پرسی ئەویش فەرمووی فەرمانم بەهاوەڵان کردووە بەقسەم ناکـەن، بـەڵام (ام سلمە) فـەرمووی تـۆ بـە خۆت بەسەرتاش سەرت بتاشەو وشترەکەشت بکە قوربـانی بزانـین هـاوەڵان چ دەکـەن. ئـەوە بـوو پێغەمبـەر(د.خ) وشترەکەی کردە قوربـانیو سـەری خـۆی تاشی، هەموو هـاوەڵان لـەدوای پێغەمبـەری خوا کارەکەی خۆیانیان جێبەجێ کرد، جا

**لەپێش ئیسلامدا ئافرەت سەرەڕای دەردەسەری خۆی زیندە بەچاڵیش دەکراو شانازیش بەکوشتنەکەی دەکرا**

ئەو رووداوە بەرپـەچ دانـەوەی ئـەو قسە باوەیە کـە لـەناو کۆمەڵگـە کە دەڵێن: (پرسیان پـێ بکـە، بەڵام بە قسەیان مەکە) ئێمەش دەڵێـین پێغەمبـەری خـوا پرسیشی پێکردن و بەقسەشی کـردن، ئـەو بەڵگانـە بەسـن بـۆ دەمکوت کردنـەوەی ئـەو کەسـانەی کـە دەڵێـن ئیسـلام مـافی ئـافرەتی نـەداوەو شـەوو رۆژ ئـەوەیان کردۆتـە بنێشـتی سـەرزاریان دەیجونـەوەو دەهۆڵی بۆ دەکوتـن. چونکـە ئـافرەت لەسـایەی ئیسـلام مـافی ئـازادای خـۆی بەدەسـتهێناوە. ئـافرەتی کوردیـش شـان بەشـانی پیاوەکـان لەخۆشـیو ناخۆشـیو چەرمەسـەری هاوبەش بـووەو ئازایـەتی خـۆی نوانـدووە، کـورد چەندان ئـافرەتی نـاوداری هەیـە کـە هـەتا هەتایـە ناویـان لەسـەر لاپـەڕەکانی مێـژوو دەمێنـێو رەشنابێتەوە، کورد شانازیان پێـوە دەکـات. وەك: خانزادی میری سۆران و قەدەم خێرو مەستورەی کوردستانی و.. هتد.

جـا لـەکۆتاییدا بەڵگـەی زۆرمـان هـەن لەسـەر پاراستنی مافی ئافرەت لەئیسلامداو ماف و سەربەرزی هەموومان تەنها لەناو ئیسلامدایەو با تـا ئێرەش بەس بێو کورد گوتەنی (مشتێك نمونەی خەروارێکە).

# لادانی وەزیفەیی و گەندەڵی ئیداری

د. ئیبراهیم ئەبولغار — و: کەریم سۆفی

بەشێوەیەکی گشتی (گەندەڵی- Corruption) دیاردەیەکی نێگەتیڤانەی کۆمەڵایەتییەو دەتوانم بڵێم لەنێو کۆمەڵگا نوێیەکاندا زۆر بڵاوە، ئینجا ئەم کۆمەڵگەیە هەژار بێت یان دەوڵەمەند، ڕۆژهەڵاتی بێت یان ڕۆژئاوایی، هەڵبەتە بەجیاوازی ڕێژەیی ڕوودانی گەندەڵییە.

ساموێل هینتگتۆن-ی لێتوێژەری ئەمریکی وای بۆ دەچێت کە گەندەڵی: (شێوە ڕەفتارێکی لادانی فەرمانبەری گشتییە لەو پێودانگەی کەلەسەری ڕێک کەوتوون بۆ بەدیهێنانی چەندان ئامانج و مەبەستی تایبەتی). هەروەها گەندەڵی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەنێو هەموو کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە، بەڵام لەهەندێکیاندا زۆر زۆرترو زیاتر بڵاوە بەبەراورد لەگەڵ ئەویتردا. نەک هەرئەمە، بەڵکو زۆرجاران لەو قۆناغانەدا زیاتر بلاوە کە کۆمەڵگا لەحاڵەتی وەرچەرخان و گۆڕان و بەرەو پێشڤەچووندایە.

هۆکارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەبڵاوبوونەوەی گەندەڵی، پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەخێرایی پرۆسەی (نوێخوازی Modernization)ی کۆمەڵایەتیو ئابوورییەوە هەیە. هەروەها هینتگتۆن لەمیانەی نموونە هێنانەوەی لەسەر ژیانی سیاسی لەئەمریکا لە هەردوو سەدەی هەژدەو بیستی زایینیدا جەخت لەسەر بیرۆکەی خۆی دەکاتەوە بەوەی کە گەندەڵی لەم هەردوو سەدەیەدا کەمتر دەردەکەوێ بەبەراورد لەگەڵ سەدەی نۆزدەدا. هەمان حاڵەتیش بەسەر ئینگلتەرادا پیادەکرا، بەوەی کە ژیانی سیاسی تێیدا لەنێوان هەردوو سەدەی حەڤدەو بیستدا، کەمتر گەندەڵی پێوەدیاربوو بەبەراورد لەگەڵ سەدەی هەژدەدا.

لێرەدا هینتگتۆن ئەم دیاردەیە بۆ ئەو کاریگەرییە توندەیە دەگەڕێنێتەوە کە شۆڕشی پیشەسازی بەجێیهێشت. هەروەها گەشەکردنی سەرچاوە نوێیەکانی دیکەی سامان و هێزو سەرهەڵدانی چینێکی نوێو ڕووبەڕووکردنەوەی چەند داوایەک لەحکومەت، بەمەش سیستەمی سیاسی لەهەردوو قۆناغەکاندا بووە هۆی ئانەوەی کۆن و کەلەبەرو درز تێکەوتنی بنەمای کۆمەڵایەتی کە کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر لایەنی کارگێڕیو زۆر لەبوارەکانی دیکەدا هەبوو.

## ئاسەواری گەندەڵی ئیداری

ڕەنگە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی ئیداری بەشێوەیەکی ڕوون و سەرنج ڕاکێش یەکێك بێت لەسیما دیاردەکانی وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر دەبێتە لەمپەری بەردەم پرۆسەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیو ئابووری، چونکە گەندەڵی ئیداری، لەزۆر لەشێوەکانیدا بەتایبەتی (اختلاس -دزی کردن) دەبێتە وەلانان و دوورخستنەوەی ڕێژەیەکی زۆر لەسامانی ئابووری وڵات کە ئەم سامانەش بەبایەخێکی زۆر گرنگی لەپرۆسە جۆراوجۆرەکانی گەشەکردندا هەیە.

مەکمولان-ی لێتوێژەر جەخت لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکاتەوەو گەندەڵی ئیداری بەکۆسپ و تەگەرە سەرەکییەکانی بەردەم پرۆسەی گەشەکردنی ئابووریو کۆمەڵایەتی دەزانێ، وێڕای کاریگەری توندی لەسەر ئاسەقامگیری سیاسی، ئەمەش بەیەکێك لەدەرهاویشتە نێگەتیڤییەکانی سیستەمی بیرۆکراتی دەژمێردرێت.

ئەوەی جێی بیرخستنەوەیە،





ئەو زانایانەی کە لەگەندەڵی نێو وڵاتانی تازە گەشەکردویان کۆڵیوەتەوە، لەزانایانی ڕۆژئاوا بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو زانایانە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا چەمك و مەزەندەی ڕۆژئاواییان بەسەر کۆمەڵگەکانی ئەفریقیایی و ئاسیایی پیادەکردووە.

گومانی تێدانییە کە پیادەکردنی چەمك و بۆچوونی تایبەت بەکۆمەڵگەو کولتووری ڕۆژئاوا سەبارەت بەکۆمەڵگەو کولتووری جیا جیای دیکە، هەڵەیە.

## گەندەڵی ئیداری و زانایانی ڕەوشت

زانایانی ڕەوشتیش گرفتی گەندەڵییان بەشێوەیەك خستۆتە بەرباس کە مەبەستیان تێیدا وەسفکردن و پێوان و شیکردنەوەی ئەم دیاردەیە بووە. لەم بوارەدا هەردوو باسکار (الباحث) ڕۆناڵدریت و ئیدگاسیمبکنز لەکتێبەکانیاندا بەناوی (گەندەڵی لەوڵاتانی تازە گەشەکردوودا) هەوڵیانداوە لەدیاردەی گەندەڵی و بڵاوبوونەوەی لەوڵاتانی تازە گەشەکردوودا بکۆڵنەوە. ئەوانیش گەندەڵیان بەجۆرە گیایەکی زیانبەخش چووانددووە، کە لەخاکی بەپیت شین بێت و ببێتە تەگەرەی بەردەم گەشەکردنی ڕووەکە سوود بەخشەکان و گەشانەوەیان. لەراستیدا ئەم وەسفەیە، وردبوونەوەو شارەزاییەکی زۆری تێدایە، چونکە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لە هەر وڵاتێك یان لە هەر سیستەمێکی ئابووری یان کۆمەڵایەتیدا، دەبێتە مایەی دروستبوونی کەلەبەرو بۆگەن بوون لەم بوارەدا، بەمەش هەموو دەزگاکە دووچاری کەلەبەرو لەباریەکچوون و درز تێکەوتن دێت و لەکۆتاییدا دەبێتە هۆی دارمانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان.

ئەم دووباسکارە وای بۆ دەچن کە هەڵوێستی زانایانی ڕەوشت تارادەیەکی زۆر لەهەڵوێستی ئەو کەسانە جیایە کە گەندەڵی ئیداری ئەنجام دەدەن، هەر ئەفریقیاییەك کە وەختێ هەڵی ئەوەی بۆ دەرەخسێ یەکێك لەخزمەکانی خۆی لەشوێنێکی گشتی دابمەزرێنێ، ئەوە ناکرێ ئەم ڕەفتارەی بەکارێکی گەندەڵی لەقەڵەم بدرێ، چونکە لەم جۆرە کاروبارانەدا پابەندی چەند داب و نەریت و کۆتێکە کە ناچارا پێیانەوە پابەند بێت. بۆیە ئەم دوو باسکارە مەحسوبییەت و ڕوپامالّی (المجاملة)، بەخاوەو بەرتیل لەوڵاتانی ڕۆژئاوا حسێب دەکەن، بەلاّم لەوڵاتانی ئەفریقیادا لەم بازنەیە دەردەچێت.

لەروانگەی ئەم چەمکەوە هەردوو باسکار دوو مەرجی بنەرەتیان بۆ پێناسەکردنی گەندەڵی دیاری کردووە، پێناسەکەش ئەوەیە: (هەر کردەوەیەك ئەگەر هاتوو کۆمەڵگا ئەو حوکمەی بەسەرداداو ئەنجامدەرەکەشی هەستی بەتاوان کرد، ئەوا بەگەندەڵی حسێب دەکرێت)، بەلاّم لەتێڕوانینی ئەم دوو باسکارەدا، ئەم دوو مەرجە لەسەر بنەمای مەحسوبییەت و لایەنگیری لەکۆمەڵگەی ئەفریقیایدا، لەلێکۆڵینەوەکانیاندا پیادە ناکرێ. ئەم بۆچوونانەی سەرەوە نابێ بمانخاتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەم دوو باسکارە ڕازین لەسەر بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی دیاردەی مەحسوبییەت و ڕووپامالّی لەئەفریقیادا، بەڵکو دەیانەوێ لەو هۆکارانە بکۆڵنەوە کە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی ڕەفتاری گەندەڵی بەو ئومێدەی ئەفریقیاو وڵاتانی دیکەی تازە گەشەکردوو لەلێکۆڵینەوەکانیاندا سوودیان لێوەرگرن تا لەم ڕێگەیەوە بەرەو ڕاستەڕێی مەبەست هەنگاو هەڵێنن.

لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی کە زانایانی ڕەوشت لەبواری گەندەڵی ئەنجامیان داوە، ئەوە ئاراستەو بۆچوونی دیکەش لەم بوارەدا لەوڵاتانی تازە گەشەکردوودا هەیە کە ڕۆبێرت تێلمان–ی زانا کاری لەسەر کردووەو پێی وایە ئەم گەندەڵییە لەژینگەو دەوروبەرێکدا پەرەدەسێنێ کە سیستەمێکی بیرۆکراتی نوێ پاڵپشتی سیاسەتی حکومەتەکە بکات و هەندێ کەس لەبیرۆکراتییەکان بەجۆرە ڕەفتارێکەوە تێوە دەگلێن




که تا رادەیەك بە نهێنی ئەنجامی دەدەن و ناکەونـــە بـــەر هیـــچ ســــزایەکی رەسمیـــــش وەك وەرگرتنی بەرتیل و دامـەزراندنی خزم و کەس و کار لەسەر ئیش و بەکارمـەند کـە هیـچ مـەرجێکی یاسایی‌و کارمـەندی‌و لێهاتووی‌و شـارەزاییان لـەم ئیشانەدا نییـە.

لەلایـەکی دیکـەوە تێلمـان چـەند هۆکارێك دیاری دەکا بۆ زاڵبوون بەسـەر گـەندەڵیدا کـە خۆیـان لـە رێکخســــتنی بازارەکـــــاندا دەبیننـەوە، هـەتا لـەم رێگایـەوە دەکرێ بازاڕی بیرۆکراتی رەشیش کۆنترۆڵ بکرێ، ئەگەر بێتو سزای تونـدو پێویسـت پیـادە بکرێـت، ئـەوا هامشـۆکاران و بازرگانـان ناچار دەبن لەگـەڵ بازاڕی رەشـدا تێکەولێکـە نەکـەن و بێنـەوە نـاو ئـەو بازاڕانـــەی کـــە لـــەژێر چـاودێریدان. دەبـێ ئـەوەش بزانـرێ ئەگـەر هـاتوو خواسـت و ئارەزوویـــەکی دڵســـۆزانەی راستەقینە لەپشت ئاراستەکردنی ئـــەم جـــۆرە پرۆســــــەو کاروبـارە داراییانـەدا نـەبێ، ئـەوا هیـــچ ریفراندۆمێکـــی گونجـــاو شـیاوی لێ رەچـاو نـاکرێت و کارەکەش بەئەنجامی دیاری کراو ناگات.

## گەندەڵی بیرۆکراتی

رێچکەیـەکی دیکـە هەیـە کـە رالف بریبـانتی پـەیرەوی دەکـات کـە لـە(گـەندەڵی بـیرۆکراتی) دەکۆڵێتـەوە. ئـەم لێتـوێژەرەش دەڵـێ: (گـەندەڵی حکومـی‌و لادان لەقۆناغـــەکانی پێشـــکەوتنی سیاسـیدا لـە هـەموو جۆرەکـانی بیرۆکراتیدا هەیە. لەم بارەیەوەش دوازدە فاکتـــەری دەســـت نیشانکردووە کە لەدروستکردنی ئـەم گەندەڵییـەدا بەشـداریيان هەيـە. لـەبوونی دەسـت و داوێـن پـاکی و نـەرم بوونـەوەی ئاسـتی فـێربوون بەشـێوەیەکی گشـتی لەفاکتـەرە هـەرە گرنگـەکانی ئـەم جـۆرە گەندەڵییـەن، هـەروەها پشـتگوێ خسـتنی لایـەنی فـێربوونی ئـایینی بەشـێوەیەکی تایبـــەتی‌و حوکمڕانێتـــی ئیســتعماری‌و تایبەتمـەندێتی بنیادی حکومی کەدەبنە هاندەرو یارمـــەتیدەری بڵاوبوونـــەوەی گـەندەڵی بـیرۆکراتی. وێـڕای ئەمانـە، رەنگـە ئـەم گەندەڵییـە پەیوەسـت بێـت بـە قۆنـاغێك لەقۆناغـــەکانی پێشـــکەوتنی نەتـــەوەیی یـــان (قۆنـــاغی گواستنەوە-Transitional Staye)، ئا لـەو سـاتەدا کۆمـەڵگا بـەنێو گۆڕانکارییەکدا گوزەر دەکات کـە کاریگـەری بەسـەر رێسـاو بـەهاو بڕواییەکانەوە هەیە. گومانی تێدا نییـە کـە هـەندێك لـەو هۆکارانـە، رەنگە رۆڵی خۆیـان بگـێڕن لـەنێو ئـەم فاکتەرانـەی دەبنـە مایـەی دروستبوونی دیاردەی گـەندەڵی. بۆیە ناکرێ پشتگوێ بخرێن.

هەروەك دەزانین کە راسپاردەو یاسـاکانی ئـایینی ئیسـلام، بەتـــەواوی گـــەندەڵی رەت دەکاتـــەوەو گـــەندەڵکاریش لـــەدونیاو رۆژی دواییـــدا رووبـــەڕووی ســـزای خـــوێ دەبێتـەوە، بـەوەی کـە بەدەسـتی خۆیـی‌و بەخواسـت و ئـارەزووی خۆیەوە ئەم تاوانەی ئەنجامداوە، چونکە ئامادەمیزاد داوای لێکراوە کە دونیا ئاوەدانبکاتەوە لەهەموو بوارەکاندا چاکسازی بنوێنێ، نەك خەریکی بڵاوکردنەوەی گەندەڵی‌و وێرانکردن بێت.

راگرتـــن و پیـــادەکردنی کارەکانیش لەو چوارچێوانەی کە خوای گەورە دیاری کردوون و نەبـەزاندنیان، دەبێتـە مایـەی ســـەقامگیری‌و دڵنیـــایی‌و ســـەروەرێتی یاســـاو لەنگـــەر راگرتنـــی تـــای تـــەرازوی سیســـتەمەکانی کۆمەڵگـــەو پاراستنی بەها بەرزەکانی مرۆڤ. بەمـــەش دەکـــرێ لـــەکاروباری بـــەڕێوەبردن و حکومڕانیشـــدا بابەتییانەو سەر راستانە رەفتار بکـرێ‌و یەکسـانی‌و دادپـەروەری بێتـەدی‌و کۆمەڵگە گەشـەبکات و پێش بکەوێ.

**سەرچاوە:**

مجلة (الفيصل) العدد (٩١) سنة ١٩٨٧، ص٤٨-٤٩.





# بەرپرسیاریەتی لەئیسلامدا

ن: دلێر عەبدوڵلا حەسەن

لەکۆمەڵگای ئێمەدا خەڵکانێکی زۆر وا بیردەکەنەوە کە بەرپرس نین لەبەڕێوەبردنی کاروباری ولاَت، ئەوان دوورن لە هەموو جۆرە بەرپرسیاریەتێك. بێگومان ئەم بیرکردنەوەیە زۆر هەڵەیە، چونکە بەرپرسیاریەتی بەمانای راستەقینەی خۆی لەئاینی ئیسلامی پیرۆزدا لەئەستۆگرتنی ئەرك و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانە. بۆیە مرۆڤی بێدەسەلاَت کاتێ ئەمانەتی (جێنشینی خوای لەسەر زەوی) لەئەستۆگرت. ئاسمان و زەویو چیاکان لەبەرامبەر ئەم ئەرکە گرانبەهایەدا بێتوانا بوون.

فەرمانەخواییەی قبول کرد لەکاتێکدا ئەو هەموو هەسارەو دروستکراوانەی دیکە کەوا لەئادەمیزاد زۆر بەهێزترن توانای جێبەجێ کردنیان نەبوو، لێرەدا ئادەمیزاد ئامادەیی هەڵگرتنی ئەم ئەرکە پیرۆزەی وەرگرت و راگەیاند.

بەرپرسیاریەتی لەئایینی ئیسلامی پیرۆزدا لەسەر هەر تاکە کەسێکی ئەم کۆمەڵگایەدا بەپێی جیاوازی پلەو پایەو شێوازی کارەکەی پێویستە. لەسەر ئەم بنەمایە کە بەرپرسیاریەتی لەئەستۆی هەموو کەسێکە، پێغەمبەر(د.خ) **مسؤول عن راعیته فکلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیته**). پێغەمبەر(د.خ) لەم فەرمووده پیرۆزەدا دوو بنچینەی سەرەکیمان بۆ روونده‌کاتەوە:

یەکەمیان: بەرپرسیاریەتی دەخاتە ئەستۆی هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵگایە.

دووەمیان: ئەرکی بەرپرسیاریەتی پلەو پایەدارە، واتە لەدەسەلاَتی سەرووەدا پلە دوای پلە بەرەو خوارترو لەسەرووی هەمووشیانەوەی بەرپرسیاریەتی سەرۆك و پاشاو میرو سەرکردەی ولاَتە، ئەمەش بەبەڕێوەبردنی کۆمەڵ و میللەت و رۆشنکردنەوەی رێگەی راستەقینەی خۆشگوزەرانکردنی ژیان و پەیرەوکردنی بەرنامەی خوداو گرنگی دان بەیەکسانیو چەسپاندنی دادوەرییە.. بۆیە دەتوانین ئەوە بڵێین کەوا چاکسازی کۆمەڵ و بەرەو پێشەوەبردنی، بەندە بەسەرکردەو سەرداری هەر کۆمەڵ و میللەتێك ئینجا بەندە بەخەڵکانی تر. لێرەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کەوا ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری ولاَت کارێکی وا ئاسان نییە. بۆیە

**بەرپرسیاریەتی لەئایینی ئیسلامی پیرۆزدا لەسەر هەر تاکە کەسێکی ئەم کۆمەڵگایەدا بەپێی جیاوازی پلەو پایەو شێوازی کارەکەی پێویستە**

هەروەکو لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً/ سورة الاحزاب-٧٢**﴾. بەڵێ ئەوەبوو لەئاکامدا مرۆڤ ئەم

لەفەرمودەیەکیدا بۆمان روون دەکاتەوە و دەفەرموێت: **كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، فالامام راع وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راع في اهله وهو مسؤول عن رعيته، والمراة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها، والخادم راع في مال سيده وهو مسؤول عن راعيته والرجل راع في مال ابيه وهو**




ئەگەر بێت و بەزنجیرەی ئەرکی بەرپرسیاریەتی سەرەو خوار بێن ئەوە بەرپرسیاریەتی پیاو بەرامبەر ئەرکی خێزانداری دەدۆزینەوە.

ئەمەش بەراپەڕاندنی ئەرکی ماڵەوە بەچاکترین شێوەو پەروەردە کردنی منداڵ لەسەر خوا پەرستیو رەوشت بەرزیو نیشتمان پەروەریەتیو هاوکاری کردنی میللەتەکەی بەمەبەستی بەرەو پێشەوە بردنی.

بۆیە بەرپرسی سەرەکی هەر خێزانێك لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا لەئەستۆی پیاودایە. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ/ سورة التحريم-٦﴾.

سەبارەت بەئافرەتیش پێویستە دەرك بەم ئەرك و کارانە بکات کە لەسەر شانیەتی بەجێبەجێ کردنی ئەرکی ماڵەوەو یارمەتی دانی پیاوو پڕکردنەوەی کەلێنەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە پەروەردەکردنی منداڵ بەچاکترین شێوەو راگرتنی هاوسەنگی ماڵەوە لەرووی دارایيو پەیوەندییەکانی کۆمەلایەتی سنووری خێزانداری کۆمەڵگا بەگشتی. لەهەمان کاتدا بەرپرسیاریەتی (کرێکار) لە ماڵ و سامانی سەردارەکەی گرنگی تایبەتی خۆی هەیە. بۆیە پێویستە چاودێری تەواوی سامانەکەی بکات و گوێ لەفەرمان و راسپاردەکانی بگرێت. بەمەرجێك لەسنووری شەرعدا دەرنەچێت. لێرەدا پێویستە بڵێین کە کار راپەڕاندن بەشێوەیەکی دروست و پاراستنی پێداویستییەکان و هەوڵدان بۆ زیادکردنی داهاتی هەر کارێك لەلایەن کرێکارەکان یەکێکە لەو فاکتەرە گرنگانەی کەوا بواری کۆمەڵگای مەدەنی گشتیان لەچوارچێوەی خێزاندا ئەرکی زۆر گرنگی بەرپرسیاریەتی منداڵن.

لەلایەکی تردا بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بەدوارۆژی خۆی وەك نەوەیەکی داهاتووی ئەم نیشتمانەو هەست کردنی بەئەرکی سەرشانی لەوەدەست هێنانی دەسکەوتی بەرزو راپەڕاندنی پێویستییەکانی لەهەموو بارێکدا.

لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر(د.خ) ئەوەمان بۆ دوویات دەکاتەوە (**کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيته**) واتە- هەریەك

## بەرپرسیاریەتی بەمانای راستەقینەی خۆی لەئایینی ئیسلامی پیرۆزدا لەئەستۆگرتنی ئەرك و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانە

دەرەخسێنێت و متمانە لەنێوان کرێکارو خاوەن کار کە کۆمەڵگای ئێمە پێویستی زۆری پێ هەیە پتەوتر دەکات. وێڕای ئەمەش بەرپرسیاریەتی منداڵ دەربارەی دایك و باوك و کۆمەڵ و دوا رۆژی خۆی کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو کۆمەڵێك ئەرکی گرنگی دەکەوێتە ئەستۆ. لەمانەش جێبەجێ کردنی ئەرك و داخوازییەکانی دایك و باوك و پاراستنی سامان و ماڵی باوکی بەفیڕۆنەدانی. لەهەمان کاتدا پتەوکردنی سۆزو خۆشەویستیو یەك ڕیزی لەنێوان ئەندامانی ماڵەوە. ئەمانە لەئێمە بەرپرسە!.. چۆن و لەچی؟ واتە لەم کارو ئەرکانەی کەوا موسڵمانی راستەقینەو نیشتمانپەروەر لەئەستۆی دایەو دەتوانێ ئەنجامی بدات.

بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی (بڕوا و کارکردنە). ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا﴾ ئەم بنەما سەرەکییە چەندین جار لەقورئانی پیرۆزدا دوویات کراوەتەوە، کەوا کارکردن و بەرپرسیاریەتی بەهەموو شێوەکانییەوە، پێویستە مرۆڤ خۆی لێ بەدوور نەگرێت بۆ ئەوەی رەوتی ژیان بەرێچکەی راستەقینەی خۆیدا رێڕەو بکات.





# ئایا تیرور پشتی دەمەكی كەلتورێ ئولی یە؟

**خەلیل حەسەن زێوەیی**

ئاینا پیرۆزا ئیسلامێ سەرەرای هندێ كو پەیامەكا ئاینی و ئەخلاقییە هەم دەم فاكتەرەكا ب هێزە بۆ هەڤگرتن و ئێك رێزیا تەڤایا مروڤان ل ژێر ناڤێ (امة الاسلام) هاتە قادێ ژ بۆ ڤی یەكێ سیستەمەكێ رێك و پێك و خەملاندیە ب بهایێن مرۆڤایەتیێ و ئالێن جڤاكی كوتەڤی مرۆڤ د جیهانێدا ل ژێر سیبەرا ئەڤی ئولیدا بەرەف كوم بونێ و هەڤگرتنێ دچن دور ژ نەژاد پەرستیێ و دەمار گیریێ.

رەچەلەكاتیێ نەتەوەی یێ ژ سەردەمێ پێغەمبەری بگرە و هەتا دەست هەلات داریا پێشەوایێن (ئیمام) ئەڤی ئولی پراكتیكانە و كریارانە ژبۆ جیهانێ بەرچاڤ و سەلماند كو گەرەكە ژێر ئێك دروشم ل هەڤ كوم ب بن ژبۆ بدەست ڤەئینانا ئامانجێن سەرەكی ماڤێ نەتەوی و ئەركێ نەتەوی ئولێن جودا جودا و جیاوازدا. پێتڤییە باش بزانین كو مللەتێ كورد ب درێژیا دیروكێ مینا گەلێن رۆژهەلاتا ناڤێن دویر ژ ترس و زەبروزەنگیی. ب سینگەكێ فرەهـ و پر باوەری و باوەر ب ڤێ ئولی ئینایە. ئولێ ئیسلامێ د گەل كاكلكا راستیێ و مرۆڤایەتیێ خودا هێلایە دناڤا ناخێ مرۆڤێ كوردا. بگرە گەلەك باران ژ مللەتێن دن زێدەتر دلسۆزی و كوركرن ئەنجام دایە. گەلەك جاران گەل و مللەتێن جیاواز هەڤپشك و گەل مللەتێ كورد. ل ژێر پەردەیێ ئولی و ئولواریێ (خویك و سەرانە) ل خەلكی وەرگرتیە، رۆلێ مللەتێ كورد پاش گومها خوڤە دهاڤێژن وخوە ل بەرچاڤێ خەلكی و جیهانێ ب رویەكێ ئاینی و ئیسلامێ نیشان ددەن لێ.

لێ دهان دەم دا بچاڤێ مرۆڤە لێ ژمارە دوو ل كوردی دنێریت و ئەنفال تەعریبێ دكەن.

> **مللەتێ كورد ب درێژیا دیروكێ مینا گەلێن رۆژهەلاتا ناڤێن دویر ژ ترس و زەبروزەنگیی. ب سینگەكێ فرەهـ و پر باوەری و باوەر ب ڤێ ئولی ئینایە**

دڤان هێرشێن دیماهیكێ ین كرین سەر ئەمریكا (ئوسامەیێ كورێ بن لادنێ) گوتن ئەڤ هێرشانە ناراوەستن هەتا كو هێرش و توندو تیژی لسەروانا نەهێنە راگرتن دێ بەردەوام بن ئەڤەژی گوتنا سەرۆكێ رێخراوا (القاعدة).. كە دڤێرەدا ئوسامە تەنێ باسی تەواو عەرەب دكەن لڤێرە ژی چەندین سالە مللەتێ كورد دبن زولم ستەما داگیر كەران دا دژین و ئێك رۆژی ژ دەولەتەكێ نەرازیبون خوە دیارنەكریە لسەر مللەتێ كورد. لڤێرە خویا بویە ل ڤان رۆژێن دوای یێ ل تەڤی جیهانێ موسلمان بەرگری ل دینێ خوە كریە و نەرازی بۆن ل هەمبەر وان كەسێن دژی دینی كریە. لێ جهێ داخییە كو ئوسامەی تنێ ناڤێ عەرەبان ئینایە دگوتنا خوە یا ئێكدا.

ل چشتەكێ خۆیا كۆمللەتێ فەلەستین چارێكەكا مللەتێ كورد. كوری نەدانیە بگرە ژكیمیا بارانا هەلەبجەی و چەندین ڤركرن و پاكتاو كرتنێن دن. پێدڤییە كۆ مللەتێ كوردیش هەتا رادەیەكی شارەزاییێ لڤێ رویێ بناڤێ دین وەربگریت، ئەوێ ل هەمبەر مللەتێ مەیێ موسلمان ئەنجام ددەن.







ئەرکی قەڵەم ئەرکێکی زۆر گرانە، سەردەمانی پێش ئێمە کەسێکی زۆر بەتواناو شارەزا نەبووایە نەیدەتوانی ئەسپی خۆی لەو مەیدانەدا تاوبدات، ئەو کەسەی پێی هەڵدەستا پێویست بوو خاوەن ژیرییەکی تەواو، زانستێکی بەهێز بووایە. کەسێك ماوەیەك لەم بوارەدا ژیانی نەبردبایە سەرو پێیەکانی تێدا نەخزاندبان بەنووسەر لەقەڵەم نەدەدرا، هەرچەندە باشیشی نووسیبووایە. کەچی سەردەمێك هاتە پێش خەڵکێکی زۆر دەستی پێوە دەگرێت و خۆی پێوە خەریك دەکات، هەیانە بەتەمەن و هەشیانە بچووکە. زۆر بەجورئەتەوە دەستی بۆ دەبەن و خۆیان لەقەرەی ئەو مەیدانە دەدەن. نووسەرانی پێشوو بەسەرە پەنجە دەژمێردران، کەچی ئەمڕۆ سنووری ژماردنیان بەزاندووە. ئەمڕۆ لەنووسیندا گرنگ ئەوە نییە عیلمی پێ بێت یان نا؟ گرنگ ئەوەیە ناوو شۆرەتی هەبێت. ئێستا نووسەرە بەرزو زیرەکەکان کەمتر نووسینیان دەبیرندرێت چونکە بەئاسانی خۆیان لە هەموو باسێك نادەن. نووسین بەلایانەوە ئەرکێکی قورس و گرانە بەسادەیی ناهێننە ناو هەموو باسەکان. کەچی خەریکە نووسەرەکان بەپێچەوانەوە ناویان دەبیندرێت. بۆ وابێت؟ چۆن بڵاودەبێتەوە؟ هەندێك لەنووسەران کاتێك دەیانەوێت بابەتێك بۆ شوێنێك بنێرن، لەپێشەکی بابەتەکەدا کەمێك بەشان و باڵی ئەو فکرەیە هەڵدەڵێت کە بڵاوکراوەکە بۆتە زمانحاڵی. بەمە دەتوانن جێگای خۆیان بکەنەوە. هەر بۆیەشە دەبینین بابەتەکان کەمتر ڕەخنەیین، بەتایبەتی ئەگەر ڕەخنەکە بۆ ئەو ڕۆژنامەیە یان ئەو گۆڤارەبێت، کە بابەتەکەی تێدا دەنووسرێت. پێویستە ئەوە بزانین کە نووسەری کارامە ئەوە نییە زۆر بنووسێت و ناوو دەنگی زۆرو نووسینی هەبێت. بەڵکو نووسەری زیرەك و لێهاتوو ئەو کەسەیە کە خۆی خاوەنی فکرەیەکی تەواو بێت و فکرەکەی خۆی نەدۆڕاندبێت. ئینجا بەو فیکرە قووڵ و بەو عەقیدە پاکەی هەیەتی تەواوی هیمەتی خۆی بخاتە کار بۆ ئەوەی بتوانێت کە بنووسێت. ئینجا لەکاتی نووسینیش بەوریایی دەبێت بنووسێت، هەموو دەستەواژەو هەموو جۆرە وشەیەك لەوانەیە شیاوی نووسین نەبێت. ئینجا بەتێڕوانینی خۆی هەڵبسێت کامەی بەهێزو کاریگەرە لەو وشەو زاراوانە، لەڕستەو ماناکانیدا ئەویان هەڵبژێرێت و




بیانخاته سەر کاغەز. بەکورتی نابێت بەسادەیی باسەکان وەربگرێت، بۆ ئەوەی کەسی نەیار نەتوانێت وتەکانی ببەزێنێت. سەیری نووسینەکانی پێشوو بکە، کتێبی وا نووسراوە چەندین سەدەی بەسەردا تێپەڕبووە، یان چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕبووە کەچی هێشتا ئەو نووسینانە بەها پیرۆزو راستەقینەکانی خۆیان لەدەست نەداوە. بگرە زۆر کەسیش خەریکی چاولێکردنەوەیانن کەچی ناتوانن.

گرنگ ئەوە نییە کەم یان زۆر دەنووسێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بتوانێت لەکارەکەیدا سەرکەوتن وەدەست بهێنێت. ئەوەی دەنووسێت و وشە رێزدەکات، بەڵام بۆ دوایی هەرەس دەهێنێت نەدەبوو هەر بنووسێت. یان ئەوەی دەنووسێت و ناتوانێت بەرگری لە بۆچوونەکانی بکات، نەهاتنە ناو بازنەی نووسین بۆ ئەو باشتر بوو. کەواتە نووسەری سەرکەوتوو بەتایبەتی کە نووسەرێکی ئیسلامی بێت. پێویستە مەردو چاونەترس بێت. ئەگەر لەپێناو دەربڕینی راستیدا تووشی بە هەر ئەشکەنجەو ئازارێك بێ، نابێت گوێی پێبدات و کۆڵی پێبدات. تەماشای زانا بەرزەکان بکەن، لەو کاتەی تووشی ئەشکەنجەو چەوسانەوە هاتوون لەسەر کارەکەیان سوورتر بوونە.

کە نووسەر بەو شێوە هاتە مەیدان و ئەو جۆرە نووسینانەی داڕشت لەبەرامبەردا نەیاری دروست دەبێت. بۆیە دەبینین کەمنووسی زیرەك و کارامە نەیارو خوێنەری پترن لەزۆر نووسی ناکارامە. کەواتە نووسەری سەرکەوتوو پێویستە سینگ فراوان بێت و حیساب بۆ رای بەرامبەری بکات و خۆی لەسەر گفتوگۆو دیالۆگ رابهێنێ، ئەو نووسەرەی حیساب بۆ رای بەرامبەر ناکات و قبوڵی رەخنەگرتن ناکات سەرکەوتوو نابێت، ئەم کارەش بەخۆدزینەوەو ترسنۆکی بۆ لەقەڵەم دەدرێت. هەڵچوون مرۆڤ بێ هێز دەکات و وا لەمرۆڤ دەکات کەمتر سینگی خۆی بۆ رەخنە دەکاتەوە. بەمەش بەهای خۆیو فکرەکەی لەدەست دەدات لەوانەشە بەتوندڕۆ هەژماربکرێت.

پێویستە نووسەری سەرکەوتوو زۆر بەمێژوودا بچێتەوەو سەرگوزشتەی رابردووان بزانێت، چونکە مێژوو سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ و مەزنە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بداتە مرۆڤ، چونکە بەمێژوو دەتوانرێت هەر شتێك لەشوێنی خۆی دابنێت و فێری شێوە نووسینی باش دەبێت و شارەزا دەبێت بەهۆی خوێندنەوەی ژیاننامەو ئەو هەموو شێوە نووسینانەی لەمێژوودا تۆمارکراون. بەخوێندنەوەی بابەتە مێژووییەکان فێری نووسینی باش دەبێت، نووسینی (کەمبێژی مانا زۆر) ئەو نووسینانەی زۆر وشە دووبارەدەکەنەوەو گوێ بەدووبارە کردنەوە نادەن و خوێنەر لێیان وەڕەس دەبێت.

بەم جۆرە نووسەری سەرکەوتوو دروست دەبێت و دەبێتە مایەی سوود بۆ کۆمەڵگاو، دەتوانێت خۆی بێخیتە مەیدانی قەڵەم و، خەڵکیش کارەکەی بەهەند هەڵبگرێت. هیوا خوازم بەکارەکەم سوودێکم راگەیاندبێت و کەسیش لێم نەرەنجابێت.

■





# نەخۆشییە دەروونییەکان و چارەسەری ئاینی

ئا: زەیتۆ شێخانی

لەگرنگترین ئامانجەکانی پەروەردەو تەندروستی دەروونی پێگەیاندنی هاوولاتی بەسوودو باوەڕدارەو، بنیاتنانی مرۆڤی ئازادو خاوەن ئیرادەو بیروباوەڕی پەسندە، بۆ ئەوەی خەڵك لەژیانێکی خۆش بەئاشتیو هێمنی بژیت. پەروەردە بەمانا فرەوانەکەی پەروەردەی ئایینیش دەگرێتەوە، هەروەها گەشەکردنیش بەمانا هەمە لایەنەکەی گەشەی ئایینیو رەوشتی دەگرێتەوە. خوای گەورە مرۆڤی دروستکردووەو هەر خۆشی دەزانێت چۆنی دروستکردووە، بۆیە رێگاو بەرنامەو چارەسەری بۆ داناوە، جا پێویستە زانایانی دەروونناسی، ئایین و یاسای خوای گەورە لەیادنەکەن، چونکە چارەسەری تێدایەو ئەوانیش لەخوای گەورە زاناتر نینە بەبەندەکانی. لەبیرو باوەڕی ئێمە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلاَمُ**/ سورة ال عمران/١٩﴾ واتە ئایین لای خوای گەورە ئیسلامە، کە دوا ئایینە لەبەر ئەوە پێویستە پەنای بۆ ببەین بۆ چارەسەرکردن، چونکە خوی دەفەرموێت: ﴿**وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ**/ سورة الاسراء/ ٨٢﴾ واتە ئێمە چارەسەرو بەزەیی بۆ باوەڕداران لەقورئان دادەبەزێنین و، دەفەرموێت: ﴿**قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدَىً وَشِفَاءٌ**/ سورة فصلت- ٤٤﴾ واتە: ئەی محەممەد(د.خ) پێیان بڵێ ئەم قورئانە بۆ باوەڕداران رێ نیشاندەرو چارەسەرە.

زانایانی دەروونناسی لایان روونە کە ترسناکترین هۆکاری دەروونی بۆ شڵەژانە دەروونییەکان (الاضطرابات النفسية) ململانێیەو، ترسناکترین ململانێ، ململانێیی نێوان خێرو شەڕو حەڵاڵ و حەرام و لایەنی فریشتەییو لایەنی گیانلەبەرییە لەمرۆڤ، واتە ململانێکە لەنێوان دەروونی لۆمەکارو دەروونی فەرمانکار بەخراپە دروست دەبێت و، ئەم ململانێیە کار دەکاتە سەر دەروونی ئارام و (النفس المطمئنة) دەیگۆڕێت بۆ دەروونێکی شڵەژاو، هەروەها لایەنگرانی چارەسەری دەروونی ئایینی دەڵێن خراپەکردن وا لەمرۆڤ دەکات کە هەست بەئازاری دەروونی بکات، چونکە کارێکی کردووە نەیدەویست بیکات، ئەمە ئازاری دەروونی دروست دەکات و هۆکارێکی گرنگە بۆ دەمارگرژی (توتر الاعصاب).

هەندێکی تر لەلایەنگرانی ئەم ئاراستەیە دەڵێن نەخۆشییە دەروونییەکان و دیاردە خراپەکانی گونجانی دەروونی بریتییە

لەنەخۆشییەکانی ویژدان کە راکردنە لەدەست ئازاری ویژدان.

چارەسەری دەروونی ئایینی شێوازێکی ئاراستەکردن و رێ نیشاندان و پەروەردەو فێرکردنە، چارەسەری دەروونی ئایینی لەسەر بنەمای ناسینی تاك بۆ دەروونیو ئایینیو خواو بیروباوەڕیو بەها رووحییەکان دامەزراوە، ئامانجیشی رزگارکردنی تاکی شڵەژاوە لەهەستکردن بەخراپەو گوناه، کە هەڕەشە لەدڵنیاییو ئاسایشی دەروونی دەکات.

چارەسەری ئایینی دەروونی پێویستی بەچارەسەرکاری باوەڕدارو دەروونبین (صاحب البصیرة) هەیەو، پێویستە توانای ئیقناع کردن و سروشدان و بەشداری ویژدانی هەبێت.

**لەدانناندا مرۆڤ ئەوەی لەناو دەروونیدایە بۆ خوای گەورە دەری دەخات کە دەبێتە هۆی نەمانی هەستکردن بەخراپەو گوناه و، ئازاری ویژدانی کەم دەکاتەوەو دەروونی شڵەژاو پاك دەکاتەوە**

چارەسەری ئایینیش لەلایەن چارەسەرکاری دەروونیو بەخێوکارو ئاراستەکارو پیاوانی ئایینی بەکار دەهێندرێت.

چارەسەری دەروونی ئایینی کردارێك نییە تەنها چارەسەرکار ئەنجامی بدات، بەڵکو کردارێکە نەخۆش و چارەسەرکار بەشداری تێدا دەکەن. چارەسەرکار لەگەڵ نەخۆش گفتوگۆ لەسەر چەند بابەتێك دەکەن وەك داننان و تۆبە کردن و دەروونبینیو، لەکرداری فێربوون و وەرگرتنی ئاراستەو بەهای نوێ هەردووکیان بەشداری دەکەن.

چارەسەری دەروونی ئایینیش بەچەند هەنگاوێکدا دەڕوات کە ئەمانەن:-

**١. داننان (الاعتراف):**

ئەمە سکاڵای دەروون لەدەروون دەگرێتەوە بەئامانجی رزگار بوون و لێخۆشبوون، لەدانناندا مرۆڤ ئەوەی لەناو دەروونیدایە بۆ خوای گەورە دەری دەخات کە دەبێتە هۆی نەمانی هەستکردن بەخراپەو گوناه و، ئازاری ویژدانی کەم دەکاتەوەو دەروونی شڵەژاو پاك دەکاتەوە، هەروەها دڵنیایی بۆ دەگەڕێتەوە. ئەم قۆناغە لەقورئانی پیرۆز لەسەر زمانی ئادەم و حەوا (سەلامی خوایان لێ بێت) هاتووە، کە خوای گەورە لەسەر زمانی ئەوان دەفەرموێت: ﴿**قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ/ سورة الاعراف-٢٣**﴾ واتە پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لەخۆمانکرد ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێمان نێتەوە ئێمە لەخەسارەتمەندان دەبین.

لەبەر ئەوە پێویستە چارەسەرکار یارمەتی نەخۆش بدات بۆ داننان بەخراپەو تاوانەکانی، کە دەبێتە هۆی بەتاڵکردنی هەڵچوون و هەستکردن بەگوناه کە لەدەروونیدایە.

**٢. تۆبە کردن:**

ڕێگای لێخۆشبوونەو، هیوای تاوانبارە کە گوناهەکانی رووخاندویەتی، بەتەنها تۆبە کردنە لەگوناه و





**ئەی دەروونی ئارامگرتوو بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بە ڕەزامەندیو ڕازی کراوی بۆیە ببە بەبەندەی خواو بڕۆ ناو بەهەشتەکەی**

خراپەکانی ڕزگاری دەکات. لەکاتی تۆبە کردن مرۆڤ هەست بەگەشبینیو حەسانەوەی دەروونی دەکات. تۆبە کردنیش هەروەك ئیمامی غەزالی دەفەرموێت سێ کۆڵەگەی هەیە ئەوانیش:- زانین و حال و کردەوەن.

زانین: بریتییە لەئاگاداربوونەوە لەزیانەکانی گوناه و لادان لەفەرمانی خوای گەورە.

حال: بریتییە لەهەستکردن بەگوناه.

کردەوە: بریتییە لەوازهێنان لەگوناح و خراپە و ئەنجامدانی کاری چاك.

تۆبە کردن خودی تاك دڵنیا دەکاتەوەو وای لێدەکات سەر لەنوێ خودی خۆی قبول بکاتەوەو. بۆ دڵنیاکردنەوەی نەخۆشی دەروونی پێویستە چارەسەرکار چەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز بهێنێتەوەو شی بکاتەوە بۆ ئەوەی نەخۆش بەتەواوی تێی بگات. لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ/ سورة التحريم/٨﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕوادارن تۆبە بکەن تۆبەیەکی دڵسۆزانە بەئومێدی ئەوەی کە خوای گەورە لەگوناهەکانتان خۆش بێت و بتانباتە بەهەشت و باغ و باغاتێك کە ڕووباری بەژێردا دەڕوات. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ/ سورة الشورى/٢٥﴾ واتە: هەر خوای گەورەیە تۆبە لەبەندەکانی قبوڵ دەکات و لەخراپەکانیان دەبوورێت و ئاگاداری هەموو کردەوەکانتانە.. قورئانی پیرۆز دەیان نموونەی تۆبەکردنی تێدایە، چارەسەرکار دەتوانێت بیهێنێتەوە.

٣. **دەروونبینی (الاستبصار):**

بریتییە لەگەیاندنی نەخۆش بۆ بارێك کە هۆکارەکانی نەخۆشییەکەیو گیروگرفتە دەروونییەکانیو ئەو پاڵنەرانەی کە بوونەتە هۆی ئەنجامدانی خراپەو گوناه تێبگات و، تێگەیاندنی نەخۆش لەخودی خۆیو سروشتە مرۆڤایەتییەکەیو ڕووبەڕووبوونەوەیان، هەروەها نەخۆش پێویستە لەو چاکەو خراپەی کە لەدەروونیدایە بگات و بیروباوەڕە بەرزەکانی ئایین قەبوڵ بکات، ئەم کردارە گەشەی خودی دەروونبینی (نمو ذات البصيرة) دەگرێتەوە، کە کۆنترۆڵی ڕەفتاری چاکی مرۆڤ دەکات لەدوو لایەنی سەرەکییەوە:-

لایەنی یەکەم: پەیوەندی مرۆڤ بەپەروەردگار دیاری دەکات.

لایەنی دووەم: پەیوەندی ئادەمیزاد بەبرای ئادەمیزاد دیاری دەکات و خوای گەورە دەربارەی دەروونبینی دەفەرموێت: ﴿بَلِ الْإِنْسَانُ عَلَى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ/ سورة القيامة/ ١٤﴾ واتە: بەڵکو مرۆڤ دەروونبینی خودی خۆیەتی.

٤. **فێربوون و وەرگرتنی ئاراستەو بەهای نوێ:**




بەهۆی فێربوون و وەرگرتنی ئاراستەو بەهای نوێ مرۆڤ خۆیو خەڵکی تر قەبوڵ دەکات و، توانای زیاد دەبێت بۆ خۆگرتن و بەرگە گرتنی بەرپرسیەتی و پێکهێنانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بنیاتنراو لەسەر متمانەی بەرامبەرو خۆبەخت کردن و خزمەتکردنی خەڵك، هەروەها گرتنی ئامانجی واقعیو رەوا لەژیان وەك توانای بەرگریو کارکردن و بەرهەمهێنان، بەم شێوەیە دەروونی لۆمەکار یان ویژدان یان منی بەرز (انا الاعلی) وەك دەسەڵاتێکی ناوخۆ یان چاودێرێکی دەروونی لەسەر رەفتار گەشە دەکات. دەروون پاك دەبێتەوەو دوور دەخرێتەوە لەئارەزووی نارەواو نارەوشتیو ناکۆمەڵایەتیو، رەفتاری مرۆڤ راست دەبێتەوە دوای ئەوەی خراپەکانی بەچاکە دەسڕێتەوەو دەروونی ئارام دەبێت، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ/ سورة الهود/١١٤﴾ واتە چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوەو دەفەرموێت: ﴿يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ* ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً* فَادْخُلِي فِي عِبَادِي* وَادْخُلِي جَنَّتِي/ سورة الفجر/ ٢٧-٣٠﴾ واتە: ئەی دەروونی ئارامگرتوو بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بە رەزامەندیو رازی کراوی، بۆیە ببە بەبەندەی خواو برۆ ناو بەهەشتەکەی.

### ٥. پاڕانەوە:

بریتییە لەداواکردن و پەنابردنە بۆ لای خوای گەورە بەئومێدی لابردنی زەرەرو زیان و ناخۆشییەکان، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ/ سورة غافر/ ٦٠﴾ واتە: پەروەردگارتان دەفەرموێت لێم بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِي إِذَا دَعَانِي فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ/ سورة البقرة/ ١٨٦﴾ واتە: ئەگەر بەندەکانم لەمنیان پرسی من نزیکم، وەڵامی پاڕانەوەکانتان دەدەمەوە ئەگەر بپاڕێنەوە، بۆیە با وەڵامم بدەنەوەو باوەڕم پێبهێنن بەئومێدی وەرگرتنی رێنماییەکان.

**مرۆڤ لەهەڵە پارێزراو نییە، ئەگەر هەڵەی کردو هەستی کرد ستەمی لەخۆی کردووەو ویژدانی هەڵسا، لەرەحمەتی خوا بێ بەش نابێت، بۆیە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لای خواو داوای لێخۆشبوون بکات**

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت:((**اذا سألت فاسأل الله واذا استعنت فاستعن بالله**)) واتە: ئەگەر داوات کرد لەخوا داوا بکەو، ئەگەر داوای یارمەتیت کرد لەخوا داوا بکە.

بەپاڕانەوە مرۆڤ گیانی پاك و بەرز دەبێت و بەهێز دەبێت باوەڕی. پاڕانەوە بەدڵسۆزیش باشترین چارەسەرە بۆ دەروونێك کە بەرەو هەڵدێر دەچێت، چونکە کە مرۆڤ داوای یارمەتی لەبەرزترین هێز دەکات هەست بەئارامیو دڵنیایی دەکات و ترس و غەم و شپرزەییو دڵەڕاوکێی نامێنێت.

### ٦. داوای لێخۆشبوون کردن:

مرۆڤ لەهەڵە پارێزراو نییە، ئەگەر هەڵەی کردو هەستی کرد ستەمی لەخۆی کردووەو ویژدانی هەڵسا، لەرەحمەتی خوا بێ بەش نابێت، بۆیە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ لای خواو داوای

لێخۆشبوون بکات و متمانە بەفەرموودەی خوای گەورە بکات کە دەفەرموێت: ﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا/ سورة نوح/ ١٠﴾ واتە: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە ئەو لێبوردەیە. لەشوێنێکی دیکە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرْ اللَّهَ يَجِدْ اللَّهَ غَفُورًا رَحِيمًا/ سورة النساء/ ١١٠﴾ واتە: ئەوەی کردەوەی خراپ بکات یان ستەم لەخۆی بکات لەپاشان داوای لێخۆشبوون لەخوا بکات دەبینێت کە خوا لێبووردەو بەبەزەییە. پێغەمبەریش(د.خ) دەفەرموێت: (من لزم الاستغفار جعل الله له من كل هم فرجاً ومن كل ضيق مخرجاً ورزقه من حيث لا يحتسب) واتە: هەر کەسێ بەردەوام داوای لێخۆشبوون بکات، خوای گەورە لە هەموو خەمێك فرەوانی بۆ دادەهێنێت و لە هەموو تەنگانەیەك دەرگای خۆشی لێ دەکاتەوە. رزقیشی دەداتێ کە حیسابی بۆ نەکردووە لەم شوێنە بۆی دێت.

**٧. یادکردنەوەی خوا:**

یادکردنەوە خواردنی گیانەو ئارام گرو هێور کەرەوەی دەروونە، وەسواسیو خوتخوتە (القهرية) لادەبات و، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ/ سورة الرعد/ ٢٨﴾ واتە: ئەوانەی بڕوادارن و دڵیان ئارام دەگرێت بەیادکردنەوەی خوا ئایا بەیادکردنەوەی خوا دڵ ئارام ناگرێت؟.

*** بەکارهێنانی چارەسەری دەروونی ئایینی:**

دوای ئەوەی کە چۆنیەتی ئەنجامدانی چارەسەری دەروونی ئایینیمان روونکردەوە، ئەوەماوە بڵێین لەکوێ بەکاردێت؟ چارەسەری ئایینی دەروونی بەشێوەیەکی تایبەتی لەم بارانە بەکاردێت کە هۆکارەکان و شڵەژانەکانی روونەو پەیوەستە بەرەفتاری ئایینی نەخۆش و، ئەم چارەسەرە لەم بارانە بەکاردێت: (دڵەڕاوکێ، وەسواس، هستیریا، ترسان، وێژینگی نەخۆشی "توهم المرضي"، شڵەژانەکانی هەڵچوون، گیروگرفتەکانی هاوسەریەتیو راهاتن لەسەر مەی).

لەکۆتایی ئەوەماوە بڵێین هەزار رەحمەت لە (ابن القيم) کە دەفەرموێت: چارەسەری ئایینی باشترین و بەسوودترین و سەرکەوتووترین و کاملترین چارەسەرەو کۆی هەموو چارەسەرەکانە.

> **چارەسەری ئایینی دەروونی بەشێوەیەکی تایبەتی لەم بارانە بەکاردێت کە هۆکارەکان و شڵەژانەکانی روونەو پەیوەستە بەرەفتاری ئایینی نەخۆش و، ئەم چارەسەرە لەم بارانە بەکاردێت: ((دڵەراوکێ، وەسواس، هستیریا، ترسان، وێژینگی نەخۆشی (توهم المرضي)، شڵەژانەکانی هەڵچوون، گیروگرفتەکانی هاوسەریەتیو راهاتن لەسەر مەی))**

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز
٢. د. الزهران. عبدالسلام، الصحة النفسية والعلاج النفسي، الطبعة الاولى، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٧.
٣. د. الزهران. عبدالسلام، لتوجيه والارشاد النفسي. الطبعة الاولى، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٧.







# لەدادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانەوە

ئا/ مافپەروەر: سیروان ئەحمەد

**زنجیرە بڕیارێکی دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانە، گۆڤارەکەمان لە هەموو ژمارەیەکیدا دوان لەو بڕیارانە وەردەگێڕێتە سەر زمانی کوردی کە پەیوەستن بەئەوقاف و مەسەلە شەرعییەکانەوە، ئەم کارەش هەنگاوێکی بەراییانەیە لەرێگەی بەکوردی کردنی یاسا.**

١. دەستەی باری کەسی لەدادگای تەمیزی هەرێمی کوردستانی عێراق لەرێکەوتی ٤/موحەرەم/١٤٢١ك بەرامبەر ٨/٤/٢٠٠٠ز بەسەرۆکایەتی دادوەری (الاقدم) بەڕێز (جەلال زێوەر عومەر)و ئەندامیەتی هەردوو دادوەر بەڕێزان (نازم محەممەد ئەمین جەمیل حەویزیو سەلاح ئەحمەد یەعقوبی) پێکهات، کە ڕێپێدراون بەناوی گەلەوە دادوەری بکەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد:- خاوەن تەمییز: داوالێکراو/ج. بریکارەکەی پارێزەر(ك) تەمیز لەسەرکراو: داواکار/ ر. بریکارەکەی پارێزەر(و) داواکار(ر) لەبەردەم دادگای باری کەسی لەهەولێر بانگەشەی ئەوەی کرد کە داوالێکراو لەرووی شەرعەوە مێردیەتی، ئەویش بەپێی گرێبەندی خێزانی ژمارە ١٥٦٤/٩٩٠ کە لەدادگای باری کەسی هەولێر دەرچووە لەرێکەوتی ١٨/٧/١٩٩٠ لەسەر مارەیی پێشەکی وەرگیراو بەبڕی (٦٠٠٠) شەش هەزار دینارو، (١٩) میسقاڵ




زێڕی پاشەکی، هەریەکە لەم منداڵە ناکامانەشیان لێ بووە: (ج) لەدایك بووی ١٩٩١، (ی) لەدایك بووی ١٩٩٢، (م) لەدایك بووی ١٩٩٣، (ح) لەدایك بووی ١٩٩٤و (ك) لەدایك بووی ١٩٩٥، ئێستاش هەموویان لەئامێزی باوکیاندان کە لەدەرەوەی دادگا سێ بەسێ دایکیانی تەڵاق داوە ئەویش دوای ئەوەی بێ هیچ پاساوێك لێیداوەو دەست درێژی کردۆتە سەرو دەری کردووە لەدووەم ڕۆژی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان کە دەکاتە ڕێکەوتی ١٩٩٩/١٢/١٠. پاش ئەوەیماڵی خێزانیەتی بۆ ماوەی شەش ڕۆژو دوور لەمناڵەکانی بەجێهێشت لەڕۆژی ١٩٩٩/١٢/١٥ گەڕایەوە ماڵی خێزانی ئەویش بۆ ئەوەبوو تا تووڕەییەکەی داوالێکراو دامرکێتەوە، بەڵام هەر سێ بەسێ تەڵاقیدا هەرچەندە نەیاری نیشاندا. بۆیە بانگهێشتی کرد بۆ دادبینیو حوکم دەرکردن بەپەسەند کردنی ئەو تەڵاقەی لەنێوانیاندا کەوتوەو خەرجیەکانیشی بکەوێتە ئەستۆ، لەئەنجامی دادبینیە ئاشکراکەو بەئامادەبوونی هەردوولا، دادگای ناوبراو لەڕێکەوتی ٢٠٠٠/٣/٢٥و بەژمارەی دۆسیە ٦٣/ش/٢٠٠٠ حوکمێکی دەرکرد بەپەسەند کردنی تەڵاقە (رجعي)ەکە، کە لەدەرەوەی دادگا کەوتووە لەڕێکەوتی ١٩٩٩/١٢/١٥ کە گۆڕدرا بەتەڵاقی (بائن بینونة صغری) ئەویش لەبەر بەسەرچوونی (عدة) شەرعییەکە، بۆ داوالێکراویش نییە داواکار بگەڕێنێتەوە لای خۆی مەگەر بەگرێبەندو مارەییەکی نوێ نەبێت، کە ژنەکە لەسەری ڕازی بێت، (عدة)ش نییە چونکە بەسەرچووەو بۆ ژنەکەش نییە شوو بکاتەوە بەپیاوێکی تر تا حوکمەکە دوا پلەی خۆی وەرنەگرێت، هەروەها داوالێکراویش خەرجیو ماندوبوونی پارێزەرایەتی بریکاری داواکاریشی بکەوێتە ئەستۆ کە(و)ە بەبڕی (١٠٠) سەد دینار.

لەبەر ئەوەی بریکاری داوالێکراو قەناعەتی بەحوکمی ناوبراو نەهات تانەی لێدا ئەویش بەپێی لائیحەی تەمیزی لەڕێکەوتی ٢٠٠٠/٤/٣و لەهەمان ڕێکەوتیشدا ڕەسمەکەیدا، تیایدا داوا دەکات کە حوکمەکە هەڵبوەشێتەوە لەبەر ئەو هۆکارانەی تیایدا هاتووە، دوا بەدوای گەیشتنی دۆسیەی دەعواکە بەم دادگایە خرایە بەرباس و وردکارییەوە:-

## بڕیار:

دوا بەدوای وردبوونەوەو هەڵدانەوەی تانە تەمیزیە پێشکەش کراوەکە دەرکەوت کە لەماوەی یاساییدایە، بۆیە لەڕووی شێوازەوە قبوڵ کرا. دوا بەدوای تێڕوانینەوە دەرکەوت ڕاستەو یەکانگیرە لەگەڵ شەرع و یاسادا، چونکە ئەوەی چەسپیووە ئەوەیە کە دەستەواژەکە بەشێوەیەکی ڕەها هاتووەو لەسەر هیچیش هەڵنەپەسێردراوەو بەسەر ماددەی ٣٤/یاسای باری کەسیشدا دەگونجێت، چونکە ئەو تەڵاقەی بەقسە یان ئاماژە کردن بەندە بەژمارەوە هەر بەیەکێك دەکەوێت م٢/٣٧ لەهەمان یاسا، بۆیە بەتەڵاقی (رجعي) دادەنرێت و، لەبەر تێپەڕبوونی ماوەی (عدة)ش گۆڕدرا بەتەڵاقی (بائن بینونة صغری) بەڵام (مخالعة) مەرجدارە بەئیجاب و قبوڵەوە (م٤٦) بەڵام بانگەشەی ئەوەی کە ژنەکە دوای کەوتنی تەڵاقەکە وازی لەمافەکانی خۆی هێناوە ئەگەر ڕاست بێت ئەوە تەڵاقەکە ناگۆڕێت بۆ (مخالعة)و لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەم دەعوایەیە، بۆیە بڕیاردرا حوکمە تەمیز کراوەکە پەسەند بکرێت و تانە تەمیزییەکانیش ڕەت بکرێنەوە، خاوەن تەمیزیش ڕەسمی تەمیزی بکەوێتە ئەستۆو بڕیارەکەش بەڕێکەوتن لە ٢٠٠١/٤/٨ دەرچوو.

**سەرۆك**

**جەلال زێوەر عومەر**





٢. دەستەی باری کەسی لــەدادگای تــەمییزی هــەرێمی کوردســتانی عــێراق لەرێکــەوتی ١٦/شـــەوال/١٤٢٠ك بەرامبەر ٢٣/١/٢٠٠٠ بەسەرۆکایەتی دادوەری (الاقـــدم) بەڕێز (جــەلال زێــوەر عومــەر)و ئەندامیــەتی هــەردوو دادوەر بەڕێزان (نازم محەممەد ئەمین جەمیل حــەوێزی‌و د. محەممەد عومـــەر مــەولود) پێکــهات کــە ڕێپێــدراون بەناوی گەلەوە دادوەری بکەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد:-

خاوەن تەمییز: داواکار/ أ، بریکارەکەی پارێزەر(ن)

تەمیز لەسەر کراو: / ب، بریکارەکەی پارێزەر(و)

داواکـار (أ) لای دادگـای بـاری کەسـی لەهــەولێر بانگەشەی ئەوەی کرد کە داوا لێکراو (ب) لەڕووی شەرعەوە ژنیەتی‌و (دخول) بووە، بەپێی گرێبەندی ژنهێنان لەدادگای باری کەسی لەهــەولێر کــەکاری پێدەکرێـت، لەبـەر ئــەوەی لەگــەڵ مــاڵی خۆیــاندا نیشــتەجێی کــردووە بەبێ‌ئــەوەی نیشــتەجێیەکی شەرعی ســەربەخۆی بـۆ دابـین بکـات، بۆیـە داوای بانگهێشــت کردنــی کــرد بــۆ دادبینـــی‌و حوکــم لەسەردانی بەدابین کردنی نیشتەجێیەکی شەرعی سەربەخۆ بۆی لەگەڵ ئەوەی خەرجیەکانی بکەوێتە ئەستۆ. لەئەنجامی دادبینییـە ئاشـکراکە بـەئامادە بوونی هـەردوولا دادگـای نـاوبراو لـە ٢٢/١٢/١٩٩٩ بـــەژمارەی دۆســـیە ٩٨٤/ش/٩٩ حوکمێکـــی دەرکردبـوو بەڕوونکردنـەوەی دەعـوای داواکــارو خەرجیەکانیشـی بکەوێتـە ئەسـتۆ لەگــەڵ مــاندوو بوونــی پارێزەرایــەتی بــۆ بریکــاری داوا لێکــراو پارێزەر (و) بەبڕی (١٠٠) سەد دینار. لەبەر ئـەوەی داواکــار قەناعــەتی بــەحوکمی نــاوبراو نــەهات، بریکارەکــەی تــەمیزی کــردەوە بــەپێی لائیحــە تەمییزیەکــەی لەرێکــەوتی ٢٦/١٢/١٩٩٩ لەهــەمان رێکەوتیشــدا رەسمەکەشــی بــۆدا، دوابــەدوای گەیشتنی فایلەکە بەم دادگایە خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە:

## بڕیار:-

دوابەدوای وردکاری‌و لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە تانەتەمیزییەکە لەماوەی یاسایدایە، بۆیە لەڕووی شێوازەوە قبوڵکرا، پاش تێڕوانینــەوە بەحوکمــە تــەمیز کراوەکــەدا دەرکــەوت کــە راســت نییــەو پێچەوانەی حوکمی شەرع و یاسایە بەشێوەیەك کە دادگـا کەشـفی شـوێنی نیشـتەجێ شــەرعیەکەی ئـەنجام داوەو بـۆی دەرکـەوتوە کـە ئاودەسـت و گەرماوەکە هاوبەشە لەگـەڵ خێزانێکی تـردا کـە نامۆن بەداواکار کە بەکەم و کورییــەکانی مـاڵێکی شەرعی دادەنرێن، ئەمەش (امتناع)ی داواکـار بـۆ گوێڕایـەڵی کردنـی مێردەکـەی عوزرێکـی شــەرعییە لەبــەر ئــەوە بڕیــاردرا حوکمــە تــەمیز کراوەکــە هەڵبوەشـــێتەوەو دۆســـیەی دەعواکـــەش بگەڕێنرێتــەوە دادگاکــەی خــۆی تابــەو شــێوەی ســەرەوە لەســەری بڕوات، رەسمــە تەمیزییەکــەش پاشکۆی ئەنجامەکە بێت، بڕیارەکەش بەرێکــەوتن لە٢٣/١/٢٠٠٠ دەرچوو.

سەرۆك

جەلال زێوەر عومەر



# کاتی ئەوە هاتووە ......

مەلا عبداللطيف بامۆكى

ماوەیەكە كورد ژیرانە و هوشیارانە و بوێرانە هەر دوو سەری تەرازووی هوشیاری نەتەوایەتی كوردایەتی و رابوونی ئیسلامی بەرێكی راگرتووە، زۆر ئاستەنگ و كۆسپی رێگای بڕیووە، بە ئازادی و سەربەستی یاسا و رێساو بنەما و رێنومایییەكانی دەزگای یاسا و جێبەجێ كردن و دادگای ئەنجامداوە، كێشەكانی ناكۆكی نێوان هەر سێ دەسەلأتی فەرمانڕەوای چارەسەر كردووە، هەموو دەزگاكان لە خزمەت ئەزموون دایە، رەشایی خەلك هەست بە ئارامی گیانی و دەروونی و یاسایی و دادوەری دەكات، تەنها دلڕاوكێ لەسەرمانەوە و گەشەكردن و چەسپاندنی فەرمانڕەوای كوردستان ماوە، وێڕای ئاشتی سەرانسەری و یەكگرتنەوەی مالی كورد و بوێری دەسەلأتی چوارەم (رۆژنامەوانی) و ئەو ئاسەوارە كە لە كارە دزێوەكانی رژێمە گۆڕ كراو نێوە گیانەكان و نهێنگرەكانەوە لەناو تاك و كۆمەلدا رووا و ندویانە ئێستاش رەگ و ریشەی ماوە و بەهۆی رەموزەكانیانەوە هەولدەدەن بۆ لادانی یاسا و شكاندنی رێنوماییەكان و پووچەلكردنی بنەماكان و پەرەسەندنی گەندەلی و مشەخۆریو بەلاش خۆری، نموونەی كاریگەری ئەوانە لەسەر رەوشتی كورد زۆر بە ئاشكرا هەر ماوە، دەیانەوێ كورد بێ هیوا بكەن لە حوكمی خۆمالی كورد، كە لە سەختترین كاتەكانی شۆڕش و خوێن و فرمێسكدا راستگۆیی و دەستپاكی و دلسۆزی و ئەمەكداری و نەفس بەرزی و ورەی بەرزی لەدەست نەداوە، هەر ئەوەش بووە بەرگەی ستەم و ئێش و ئازار و چەوساندنەوەی گرتووە و چۆكی بە دوژمن داداوە و بێ ئومێدی كردووە، تەنها ئەوە ماوە كە رێگە نەدرێت سۆز و خۆشەویستی بۆ فەرمانڕەوایی كورد كاربكەنە لایەنە گەشەكان و چاوپۆشی لەلایەنە تاریك و نامۆ و لاوازەكان بكەن، بە بیانووی ئەوە كە ئەزموونی كورد تازەیەو ئەو كارانە كاری نەیار و دوژمنی دەرەوەیە.

گوتاری سیاسی تەنها مەدح و سەنا و پیاهەلدان و تاریف كردن بێت و پەردەپۆشی خالە نەخۆشەكان بكرێت.

كاتی ئەوەیە كە رووی راستی هەموو رووداوەكان لەبەردەم جەماوەردا بێت و كەم و كوڕی نەشارینەوە لەمەر كەسەوە بێت، چونكە لە شاردنەوە و حەشاردان پاسەوانی راستەقینەی ئەزمونی كوردستان دلی كرمۆل و دوودل دەبێت.

كاتی ئەوە هاتووە هەموو دەزگا و فەرمانگە كارگوزارییەكان بەچاوی (رەخنە و رەخنەلەخۆگرتن)جمگە نەخۆش و لاواز و بێ كارەكان نۆژەن بكەنەوە، چیتر چاوپۆشی لە شكاندنی (هێلی سنوری فەرمانڕەوای كورد) لە ژێر هیچ بیانوو بەهانەیەكدا نەكرێت.

كاتی ئەوە هاتووە كە خەلك هەست بكات كە حوكمی خۆمالی و كاربەدەستی خۆمان جیاوازی هەیە لەكاربەدەستی داگیركەر و كارمەندی ئێمە لە كارمەندی بیانی زاناتر و پاكترە و بۆ كاتە ساتێك نابێ بیربكەینەوە (ئەو كارە خۆزگە بە پارە).

كاتی ئەوە هاتووە هەرهۆكارێك كە داگیركەر پشتی پێ دەبەستێت بۆ ئارام كردنەوەی تووڕەیی و بێزاری خەلك فەرمانڕەوای كورد دووبارەی نەكاتەوە.

كاتی ئەوە هاتووە بێ ترس هەنگاوی بڕار و گەشە پێكەوە دەست پێبكەین بە بچووكترین فەرمانگە هەتا رێگەی گەیاندن لە نێوان سەركردە و بن كردە تەخت و پوخت و بێ گرێ و كۆسپ بێت.

كاتی ئەوە هاتووە كورد لە رووی ئایینی و رێبازی ئیسلامی مەرجەعیەتی خۆی هەبێت و بەپێی ئارەزوو بەرژەوەندی خۆی و هەلەی مێژوو شكستی گەلان لەناو كورد دووبارە نەبێتەوە وە ئەم مەرجەعیەتە گەورەترین خالی وەرچەرخانی ئەمڕۆی كوردی موسلمانە.

پشت بەخوا

# شمس الاسلام

مجلة ثقافية علمية اسلامية، تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية

السنة الرابعة العدد / ١٤ رمضان ١٤٢٢ هـ / سرماوز ٢٧٠١ كوردي / كانون الأول ٢٠٠١م

